جۆرج ئۆروێڵ

# مەزرای ئاژەڵان

عیسا عوسمان
لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی

ڕۆمان



جۆرج ئۆروێڵ

# مەزرای ئاژەڵان



عیسا عوسمان
لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی

ADIBAN


# ناوەندی ڕۆشنبیری ئەدیبان

بەڕێوەبەری گشتی: نارامی مەلا محەمەد

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، فولکەی گۆزەکان، نزیک ناوەندی ڕۆژهەڵاتی کوردان.

پەیوەندی: 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369.

Email: bookadiban@gmail.com

Facebook: https://www.facebook.com/eadiban/


ناسنامەی کتێب


ناونیشان: مەزرای ئاژەڵان.

نووسەر: جۆرج ئۆروێل.

وەرگێڕانی: عیسا عوسمان.

پێداچوونەوەی: کەیوان هەورامی.

بابەت: ئەدەبیاتی ئینگلیزی - سەدەی 20م.

ژانر: ڕۆمان.

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم.

بڵاوکەرەوە: ناوەندی ڕۆشنبیری ئەدیبان.

ساڵی چاپ: 2020 میلادی.

تیراژ: 1000 دانەی لێ چاپکراوە.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (1161) ساڵی (2019) پێ دراوە، ئەم کتێبە لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبانە،

## پێشەکیی جۆرج ئۆروێڵ بۆ چاپە ئۆکرانییەکە

وەرگێڕانە ئۆکرانییەکەی مەزرای ئاژەڵان پێشکەش بە هاوڵاتییانی ئۆکرانیی ئۆردوگاکان و ئاوارەکانی ئەڵمانیا کرابوو کە دوای جەنگی جیهانیی دووەم کەوتبوونە ژێر فەرمانڕەوایی ئەمریکا و بەریتانیاوە. بە قسەی وەرگێڕە ئۆکرانییەکە *ئایهۆر* شویزینکۆ، ئەمانە خەڵکانێک بوون کە پشتگیریی شۆڕشی تشرینی یەکەمیان کردبوو و سوور بوون لەسەر پاراستنی دەستکەوتەکانی، بەڵام لە بەرانبەردا، دژی شۆڕشە بۆناپرتییەکەی ستالین و چەوساندنەوەی هاوڵاتیانی ئۆکرانی لەلایەن ڕووسە ناسیۆنالیستەکانەوە، وەستابوونەوە. خەڵکانێکی سادە بوون، جووتیار و کرێکاری ئاسایی، هەندێکیان تا ڕادەیەک خوێندەوارییان هەبوو، بەڵام گشتیان بە تامەزرۆییەوە دەیانخوێندەوە. جا وەرگێڕ داوای لە جۆرج ئۆروێڵ کردووە کە بە تایبەت پێشەکییەک بۆ ئەم هاوڵاتیانە بنووسێت. دەقە ئینگلیزییە ڕەسەنەکە ئاسەواری نەمابوو و ئەو نوسخەیەش کە دەست خرابووەوە، لە هەمان چاپە ئۆکرانییەکەوە وەرگیرابوو کە لە ئینگلیزییەوە وەرگێڕدرابوو. ئۆروێڵ سوور بوو لەسەر ئەوەی لە بەرانبەر بڵاوکردنەوە و وەرگێڕانی بۆ ئەو نەتەوانەی کە هاوڵاتیانیان وەک پێویست پارەیان نییە تاکوو بیکڕن (وەک: چاپە فارسی و تیلگوییەکە) هیچ پارەیەک وەرنەگرێت. دواتر هەر خۆیشی پارە و هەقی چاپە ڕووسییەکەی دا کە دانرابوو بدرێتە سەرباز و ئێشکگرەکانی سەرسنوور.

داوام لێکراوە پێشەکییەکی تایبەت بە وەرگێڕانە ئۆکرانییەکەی مەزرای ئاژەڵان بنووسم. ئاگادارم کە ئانوسات بۆ خوێنەرانێک دەنووسم کە هیچیان لەبارەوە نازانم، هەڵبەت دڵنیام کە ئەوانیش تاکوو ئێستە بچووکترین دەرفەتیان بۆ نەڕەخساوە تاکوو شتێک لەبارەوەی منەوە بزانن.

لەم پێشەکییەدا، بە ئەگەرێکی زۆر چاوەڕوانیی ئەوەم لێ دەکرێت کە سەبارەت بە چۆنییەتیی نووسینی مەزرای ئاژەڵان بدوێم، بەڵام سەرەتا دەمەوێت کورتەیەک لە ژیانی خۆم و ئەو ئەزموون و پێگە سیاسییە باس بکەم کە پێی گەیشتووم.

من ساڵی ١٩٠٣ لە هیندستان لە دایک بووم. باوکم لە بەڕێوەبەرایەتیی ئینگلیزەکاندا ئەفسەر بوو و خێزانەکەشم خێزانێکی ئاسایی چین‌مامناوەند و ئەندامەکانیشی فەرمانبەری ئاسایی بوون، پیاوانی ئایینی، ئەفسەری حکوومەت، مامۆستا، پارێزەر، دکتۆر... هتد. لە *ئیتۆن* کە یەکێک بوو لە گرانترین و شاهانەترین قوتابخانە ئینگلیزییە گشتییەکان، خەرامە بەر خوێندن. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت من تەنیا بە بۆنەی دەرماڵەکەوە ڕۆیشتمە ئەوێ، گەرنا باوکم لە ڕووی ماددییەوە هەرگیز توانای نەبوو بمنێرێتە قوتابخانەیەکی لەو جۆرە.

دواتر هێندەی نەبرد وازم لە خوێندن هێنا و (ئەوکات تەمەنم نەگەیشتبووە بیست ساڵ) ڕۆیشتمە بۆرما تاکوو پەیوەندی بە پۆلیسی ئیمپریالی[1] هیندییەوە بکەم. هەڵبەت ئەمانە پۆلیسی

---

[1] Imperial: ئیمپراتۆری، داگیرکاری.

چەکدار بوون، جۆرێک بوون لە جەندرمە و زۆر لە *واردیا سڤیلی*[1] ئیسپانی و *گاغدی مۆبیلی*[2] فەرەنسی دەچوون. بەو جۆرە و بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە خزمەتدا مامەوە. دواتر بۆم دەرکەوت کە ئەم کارە لەگەڵ مندا نایەتەوە و دواجار وای کرد رقم لە ئیمپریالیزم[3] ببێتەوە، هاوکات لەو کاتانەدا، هەستە نەتەوەییەکان زۆر زەق نەبوون و پەیوەندیی نێوان ئینگلیز و بۆرمییەکان تا رادەیەک دۆستانە بوو. لە ساڵی ١٩٢٧دا دەستم لە خزمەتکردن هەڵگرت و رۆیشتمە ئینگلتەرا تاکوو ببمە نووسەر، هەڵبەت سەرەتا لە بواری نووسیندا، سەرکەوتنێکی وام بەدەست نەهێنا. لە ماوەی ساڵانی ١٩٢٨-١٩٢٩دا لە پاریس ژیام و چەندان کورتەچیرۆک و رۆمانم نووسین کە کەس ئامادەگیی ئەوەی تێدا نەبوو چاپیان بکات (هەر ئەوکاتیش هەموویانم لەناوبردن). ساڵانی دواتر، بە کولەمەرگی ژیام و چەندان جاریش برسی و بێدەرەتان کەوتم. ئەوەی راستی بێت، تەنیا دوای ساڵی ١٩٣٤ توانیم بە پارەی نووسین ژیانی خۆم بەرێ بکەم. لەو ماوەیەشدا جار هەبوو کە مانگێکی تەواو لەنێو خەڵکی رەشورووت و هەژار و کەم تا زۆر تاوانبار و بکوژدا دەژیام، کە لە خراپترین و هەژارترین شوێنەکاندا دەیانگوزەراند، یاخود بە مەبەستی سواڵ و دزیکردن دەچوونە شەقامەکان. ئەوکات بەهۆی مایەپووچبوون و نەمانی پارەوە هاوبەشیم لەگەڵ دەکردن، بەڵام دواتر خودی

---

[1] Guardia Civil

[2] Garde Mobile

[3] کردەی بەهێزکردن و فراوانکردنی دەسەڵات لە رێی داگیرکاری، قۆرخکردنی ئابووری و سیستەمی سیاسیی وڵاتانی دیکەوە.

شێوازی ژیانیان بووە جێی سەرنجم. چەندان مانگی دیکەم (بەڵام ئەم جارەیان ڕێکخراوتر) بە وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە لە بارودۆخی کرێکارانی کانە خەڵوزییەکان بەڕێ کرد. لە ساڵی ١٩٣٠دا بە هیچ شێوەیەک خۆم وەک سۆسیالیست نەدەبینی، هاوکات هیچ بیروڕایەکی سیاسیی تایبەت بە خۆمم نەبوو. بەڵکوو ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە من زیاتر لە ڕقی ئەو ڕێگە قێزەونانەی کە کرێکارانی پیشەسازییان پێ کپ و سەرکوت دەکرا بوومە سۆسیالیست، نەک ئەوەی کە خۆم مەیلێکی تیۆری و فکریم بۆ ئەو بەرنامە کۆمەڵایەتییە هەبێت.

لە ساڵی ١٩٣٦دا ژیانی هاوبەشم پێک هێنا و کەم تا زۆر هەر لە هەمان هەفتەدا، شەڕی ناوخۆ لە ئیسپانیان هەڵگیرسا. من و هاوسەرەکەم ویستمان بچینە ئیسپانیا و شەڕ بۆ حکوومەتی ئیسپانی بکەین. لە ماوەی شەش مانگدا و هەر کە لە نووسینی ئەو کتێبە بوومەوە کە خەریکی بووم، ئێمە ئامادەی ڕۆیشتن بووین. جا لە ئیسپانیا، شەش مانگ لە بەرەکانی پێشەوەدا شەڕم کرد، تاکوو نیشانەشکێنێکی فاشیستەکان گوولەیەکی بە قوڕگمەوە نا.

لە قۆناغەکانی سەرەتای شەڕدا، بێگانەکان تەواو بێئاگا بوون لەو هەوڵ و دەستتێکەڵکردنەی حیزبە سیاسییەکان لەگەڵ حکوومەتدا. بە درێژایی چەندان ڕووداوی یەک لەدوای یەک، وەک زۆربەی هەرە زۆری بێگانەکانی تر، پەیوەندیم بە سوپای نێودەوڵەتییەوە نەکرد، بەڵکوو پەیوەندیم بە ڕیزەکانی

میلیشـــیای «POUM»[١] کـــرد، یـــاخود باشـــتر بڵێـــین، شوێنکەوتووە ئیسپانییەکانی ترۆتسکی.

لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٣٧دا، کاتێک کۆمۆنیستەکان دەستیان بەسەر (هەڵبەت مەبەستم لە دەستبەرداگرتنێکی سەرتاسەری نییە) حکوومەتی ئیسپانیدا گرت و کەوتنە کوشتنی لایەنگرانی ترۆتسـکی، ئـێمەش خۆمـان لەنێـو قوربانییەکانـدا دۆزیـیەوە. هەڵبەت زۆر بەبەخـت بـوون کە زینـدوو و بێوەی لە ئیسـپانیا دەرچـووین و تەنـانەت جـارێکیش دەسـتگیر نەکـراین. زۆربەی دۆست و هاوڕێیانمان لەوێ کوژران، یان ماوەیەکی درێژیان لە زینـدان بەڕێ کـرد، یـاخود زۆر بە سـادەیی ئاسـەواریان سڕایەوە.

ئەم هەڵمەتی ڕاوەدوونـان و کوشـتنەی ئیسپانیا، لە یەکێتیی سـۆڤیەتدا وەک چاکسـازی و پـاککردنەوەیەکی مەزن، یـاخود چارەسـەر و دەرمانێـک سـەیر دەکـرا. لە ئیسـپانیادا هەروەک ڕووسیا، سرووشتی تۆماتبارکردن (ڕوونتر بڵێم، پیلانگێڕان بە هاوکـاری فاشیسـتەکان) هەمـان وێـنەی هەبـوو، سـەبارەت بە ئیسپانیاش دەکرێت بڵێم کە گەلێک هۆکارم هەبوون تاکوو بڵێم کە ســـــەرلەبەری ئەم تۆمەتبارکردنـــــانە هەڵە بـــــوون. ئەزمـوونکردنی هەمـوو ئەمـانەش، وانەیەکـی باشـی فێرکـردم: فێـری کـردم کە زۆر ئاسـان بانگەشـەی *تۆتالیتارییەکـان*

---

[١] حیزبی کرێکارانی ڕێکخستنی مارکس. حیزبێکی کۆمۆنیستی بوو، سـەروەختی شـەڕی نـاوخۆی ئیسـپانیا لە لایەن شـوێنکەوتووە ئیسـپانییە چەپەکـانی ترۆتسـکی و کرێکـارانەوە دژ بە خواسـتی خودی ترۆتسکی دروست بوو.

دەتوانێت دەست بەسەر بیروڕای هاوڵاتیانی بیرڕۆشنی وڵاتە دیموکراتەکاندا بگرێت.

من و هاوسەرەکەم دەمانبینی کە چۆن خەڵکانێکی بێتاوان، تەنیا لەسەر ئەوەی گومانی ناپاکییان لێ کرابوو، فڕێ دەدرانە کونجی زیندان. هاوکات لەڕێی گەڕانەوەشماندا بۆ ئینگلتەرا، چەندان چاودێری چاوکراوە و زیرەکمان بینین کە بروایان بە ژمارەیەکی زۆری ئەو پیلانگێڕی و ناپاکی و تاوانانە کردبوو کە چاپەمەنییەکان لە دادگای مۆسکۆدا بڵاویان کردبوونەوە.

ئیدی لە هەموو کات ڕوونتر لە کاریگەریی نەرێنی و خراپی ئەفسانەی سۆڤیەت، لەسەر جووڵانەوە ڕۆژئاواییە سۆسیالیستەکان تێگەیشتم.

لێرەدا دەبێت بوەستم، تاکوو هەڵوێستی خۆم بەرانبەر بە ڕژێمی سۆڤیەت دەربڕم.

من هەرگیز سەردانی ڕووسیام نەکردووە، هەموو ئەوەیش کە لەسەری دەزانم، لە خوێندنەوەی ڕۆژنامە و کتێبەکانەوە فێری بووم. تەنانەت گەر دەسەڵاتیشم هەبێت، ئەوا حەز ناکەم تێکەڵ بە کاروبارە ناوخۆییەکانی سۆڤیەت ببم، هیچ ڕەخنەیەکیش لە ستالین و هاوکارانی سەبارەت بەم ڕێگە وەحشی و نادیموکراتانەیان ناگرم، چونکە ڕوونە کە لەو هەلومەرجەدا، گەر نیازیشیان زۆر باش بووایە، ئەوا نەیاندەتوانی بە جۆرێکی دیکە هەڵوێستی خۆیان بنوێنن.

بەڵام بۆ من گرنگییەکی ئەوتۆی هەبوو کە هاوڵاتیانی ڕۆژئاوای ئەورووپا واقیعی ڕژێمی سۆڤیەت ببینن. لە ساڵی ١٩٣٠دا هەندێک وردەبەڵگەم بەدەستەوە بوون کە یەکێتیی

سۆڤیەت بەرەو هەر شتێک هەنگاوی دەنا کە ناوی سۆسیالیزم بووایە. لە لایەکی تریشەوە تەواو تاسابووم بەو کاریگەری و نیشانە ڕوون و ئاشکرایانەی کە دەیانسەلماند یەکێتیی سۆڤییەت بەرەو کۆمەڵگەیەکی فرەچین هەنگاو دەنێت، کە تێیدا دەسەڵاتدار وەک هەر چینێکی خاوەندەسەڵاتی کۆمەڵگە، هیچ بیانوو و هۆکارێکی نییە تاکوو دەستبەرداری دەسەڵاتی خۆی ببێت. هاوکات چینی کرێکار و ڕۆشنبیرانی ولاتێکی وەک ئینگلتەرا نەیاندەتوانی لەوە تێبگەن کە ئەو یەکێتی سۆڤییەتەی لە سالانی ۱۹۱۷دا هەبوو، تەواو جیاوازە لەوەی ئێستە. بێ گومان هۆکارەکەشی دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە نەیاندەویست تێبگەن (دەیانویست گەر بە زۆریش بێت، بڕوا بکەن کە ولاتێکی سۆسیالیست لەم جیهانەدا هەیە) یانیش بە جۆرێک خوویان بە بەراوردکاریی ئازادی و میانڕەویی ژیانی ئاساییەوە گرتبوو کە تۆتالیتاریزم بە تەواوی لایان بڕواپێنەکراو بوو.

بێ گومان دەبێت بیرمان بێت کە ئینگلتەرا ولاتێکی دیموکرات نییە و ولاتێکی سەرمایەدارانەیە کە جیاوازییەکی زۆری چینایەتی و ساماندارێتیی تێدایە (تەنانەت پاش ئەو جەنگەش کە مەبەست لێی سەقامگیرکردنی یەکسانیی نێوان هاولاتیان بوو)، بەلام ولاتێکە خەڵکەکەی سەدان ساڵ پێکەوە بێ کێشە ژیاون، یاساکانی کەم تا زۆر هەمان یاسان و هەواڵ و ئامارەکانیش بە دەگمەن بڕوایان پێ دەکرێت، لەبەرانبەر پشتگیریکردنی دەنگی کەمینەیەکیش هیچ مەترسییەکی کوشندە لەسەر ژیانی کەسی پشتگیریکەر نییە. لە کەشێکی لەم جۆرەدا، مرۆڤێکی سەرشەقام هیچ تێگەیشتنێکی ڕاستەقینەی بۆ

ئوردوگا و ئەو ژمارە زۆرەی دیپۆرتکردن و دەستگیرکردنی بێ دادگایی و سانسۆری چاپەمەنییەکان نییە. بەڵکوو هەر شتێک سەبارەت بە یەکێتیی سۆڤییەت دەیخوێنێتەوە، ڕاستەوخۆ وەرگێڕدراوەتە سەر زاراوەی ئینگلیزی و ئەویش بەستەزمانانە باوەڕ بە درۆی بانگەشەکارە تۆتالیتارییەکان دەکات. لەگەڵ هاتنی ساڵی ١٩٣٩دا زۆربەی زۆری ئینگلیزەکان نەیاندەتوانی پێشبینی و وێنایەکی سرووشتی و ڕاستەقینەی ڕژێمی نازییەکان لە ئەڵمانیادا بکەن، ئێستەش سەبارەت بە ڕژێمی سۆڤییەت، ڕێژەیەکی زۆریان هەر لەناو هەمان وەهمدا دەژین.

ئەمەش زەبرێکی باشی بە جووڵانەوەی سۆسیالیستەکان لە ئینگلتەرادا گەیاند و کاریگەرییەکی خراپ و توندیشی لەسەر سیاسەتی دەرەوەی ئینگلیز هەبوو. بەڵام بە ڕای من هێشتاش هیچ شتێک وەک ئەو بیروبۆچوونە زیانی بە فکری ڕاستەقینەی سۆسیالیزم نەگایاندووە کە وا بزانرێت ڕووسیا وڵاتێکی سۆسیالە و هەموو جووڵە و چالاکییەکی دەسەڵاتدارانیشی یان دەبێت پەیڕەو بکرێت، یاخود چاوی لێ بپۆشیرێت.

هەر بۆیە لە دە ساڵی ڕابردوودا، گەیشتبوومە ئەو بڕوایەی کە ئەگەر نیازی دووبارە هەستاندنەوەی جووڵەی سۆسیالیستەکانمان هەبێت، ئەوا پێویستە ئەفسانەی سۆڤییەت تێک بشکێنین.

هەر کە لە ئیسپانیا گەڕامەوە، بیرم لەوە کردەوە کە ئەم ئەفسانەی سۆڤییەتە لە چیرۆکێکدا بنووسمەوە، بە جۆرێک کە

هەمووان ئاسان لێی تێبگەن و بە ئاسانی بۆ هەموو زمانەکانی جیهـــانیش وەربگێڕدرێـــت. هەڵـــبەت تـــا مـــاوەیەکیش هەر وردەکارییەکـانی چیرۆکەکە لە سـەرمدا گەڵاڵە نەدەبـوون، تـا ڕۆژێکیـان (ئەوکـات لە لادێیەکـی بچووکـدا دەژیـام) کـوڕێکی بچـووکم بینـی کە پێـدەچوو دە سـاڵان بێـت، گالیسـکەیەکی گەورەی بە ڕێیەکی تەنگەبەردا دەئـاژووژت و گەر ئەسپەکان بیانویستبا بگەڕێنەوە، ئەوا دەیدانە بەر قامچی. بەلامەوە زۆر سـەیر بـوو و بیـرم کـردەوە کە ئەگەر ئەم ئـاژەڵانە ئەقڵیـان بە دەسـەڵات و توانـای خۆیـان بشـکابا، ئەوا ئێمە بەسـەریاندا زاڵ نەدەبـووین، جـا بینـیم کە وەک چـۆن مرۆڤەکـان ئاژەڵەکـان دەچەوســـێننەوە، ئەوهـــاش دەوڵەمەنـــدەکان پرۆلیتارەکـــان دەچەوسێننەوە.

بەم شێوەیە کەوتمە شیکارکردنی تیۆریی مارکس لە دیدگەی ئـاژەڵانەوە. بـۆ ئاژەڵەکـان بیـرۆکەی ململانێـی چینـایەتی مرۆڤەکان تەنیا وەهمێک بوو، چونکە هەرکات پێویستی بکردبا ئەوا بـۆ چەوسـاندنەوەی ئاژەڵەکـان یەکیـان دەگـرت، بەڵام ململانـێ ڕاسـتەقینەکە لەنێـوان مـرۆڤ و ئاژەڵەکانـدا بـوو. لەم دیدگەیەشـەوە، قـورس نەبـوو چیـرۆکەکە دابڕێـژم. تـا سـاڵی ١٩٤٣ش چیـرۆکەکەم نەنووسـی، چـونکە هەمیشـە بە هەنـدێک کاروبـــاری تـــرەوە ســـەرقاڵ بـــووم کە هـــیچ کاتیـــان بـــۆ نەهێشـتبوومەوە. لە کۆتاییشـدا هەنـدێک بـۆنەم سـاز دان، بـۆ نموونە کۆنفراسی تاران، کە لە کاتی نووسینی ڕۆمانەکەدا پێی هەسـتام. بەم جـۆرەش پـێش ئەوەی دەسـت بـدەمە نووسـینی، بیرۆکە و نەخشـەی چیرۆکەکە بۆ ماوەی شەش ساڵی ڕێک لە سەرمدا بوو.

حەز ناکەم هیچ شتێکی لەبارەوە بڵێم، چونکە هەر کارێک خـۆی نەدوێـت، ئەوا شکسـتخواردوو و بـێکەڵکە. بەڵام بە پێویستی دەزانـم دوو خـاڵ ڕوون بـکەمەوە: یەکەم، هەنـدێک بەش و بـڕگەی جیـاوازی کتێـبەکە، لە مێـژووی ڕاسـتەقینەی شۆڕشـی ڕووسـیاوە وەرگیـراون، کـۆی ئەم ڕووداوانە بە شـێوەیەکی پوخـت و کـورت دانـراونەتەوە، بەڵام ڕیزبەنـدیی کـاتی ڕوودانیـان گۆڕانکـاریی بەسـەردا هـاتووە، چـونکە بـۆ ئەوەی زیاتر لەگەڵ چیرۆکەکەدا بێنەوە، پێویستی دەکرد بەو جۆرە بن. دووەم خـاڵ کە زۆربەی ڕەخنەگران مێشکیان هەر بە لایدا نەچووە، هۆکارەکەشی ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە من وەک پێویست ڕوونکردنەوەم نەدابێت. ڕەنگە هەندێک لە خـوێنەران لەگەڵ تەواوبـوونی ڕۆمـانەکەدا، ئەو بیرۆکەیـان لا دروست ببێت کە بەراز و مرۆڤەکان بە جۆرێک لە جۆرەکان پێک دێنەوە. بەڵام من هیچ مەبەستێکی لەو جۆرەم نەبووە، بەڵـکوو بە پـێچەوانەوە، دەمویسـت لە کۆتاییـدا سـەرنجێکی ناسەقامگیر و ڕقەبەرانە لە مێشکی خوێنەردا چێ ببێت. چونکە من هەر دوای کۆنفراسـەکەی تارانیش هەمـان قسـەم کرد، لە کاتێکـدا هەمـوان پێشـبینیی ئەگەری زۆر باشـی سـازانیان دەکـرد لەنێـوان یەکێتیـی سـۆڤییەت و خۆرئـاوادا. مـن بـڕوام نەدەکـرد ئەم دۆسـتایەتییە تـا سـەر بـڕ بکـات. دروسـت بەو جۆرەی کە بۆی چووبووم، دواتر کۆبوونەوەکان نیشـانیان دا کە لە قسەکانمدا بەهەڵەدا نەچووبووم.

نـازانم پێویسـتە چیتـر بڵـێم. بـۆ ئەوانەش کە حەز دەکەن سەبارەت بە ژیانی تایبەتیی من بزانن، ئەوا ئەمەشی بۆ زیاد

دەکەم، من بێوەپیاوێکم، کوڕێکم هەیە و پیشەم نووسینە و هەر لە سەرەتای جەنگەوە وەک ڕۆژنامەنووس کارم کردووە.

ئەو گۆڤارەش کە زۆر جددی سەروکاریی دەکەم، ناوی تریبیونە[1]، گۆڤارێکی هەفتانەی سیاسی-کۆمەڵایەتییە کە بە گشتی تێیدا قسە لەسەر باڵی چەپی حیزبی کرێکاران دەکرێت. هەرچی کتێبەکانی دیکەشمە، ئەوانەی کە دەکرێ بە کەڵکی خوێنەرێکی ئاسایی بێن (کە هەڵبەت هەموو خوێنەرێکی ئەم وەرگێڕانە بێ دوودڵی پێویستە دەستیان بخات) ئەمانەن: *ڕۆژە بۆرمییەکان*[2] (چیرۆکێکە سەبارەت بە بۆرما)، *ڕێزلێنانی کەتەلۆنیا* (کە تێیدا باسی ئەزموونی شەڕی ناوخۆی خۆمم لە ئیسپانیا کردووە)، هەروەها چەند وتارێکی ڕەخنەیی (هەڵبەت بە پلەی یەکەم، وتار سەبارەت بە ئەدەبیاتی بەناوبانگ و هاوچەرخی ئینگلیزی و سوودبینین لێی لە دیوە کۆمەڵایەتییەکەیەوە نەک ئەدەبییەکەی.)

---

[1] Tribune

[2] Burmese Days

## بەشی یەکەم

بەڕێز جۆنسی خاوەنی *مەزرای مەینەر* شەو کولانەی مریشکەکانی کڵۆم دا، بەڵام لەوە بەدمەستتر بوو بیری بێت دەلاقەی دەرگاکان دابخات. بە یارمەتیی ئەڵقەی ڕووناکی ئەو چرایەی کە بە ڕاست و چەپدا سەمای دەکرد، دارەدار تەویلەکەی تێپەڕاند. لە دەرگای پشتەوەدا گیرسایەوە و بە تەکانێک پووتەکانیی داکەندن و دواهەمین پەرداخە ئاوجۆی لە تەختەبەرمیلی موبەقەکەدا تێکرد، جا ڕێی خۆی بە قادرمەکاندا بەرەو تەختەخەوەکەی گرتە بەر کە لەوێ *خاتوو جۆنس* پرخەی دەهات.

هەر ئەوەندەی ڕووناکیی ژووری نووستنەکەی بەڕێز جۆنس خامۆش بوو، فرەفڕی باڵ و دەنگەدەنگێک لە سەرانسەری بیناگەلی مەزراکەدا هاتە ئارا. بە درێژایی ئەو ڕۆژە دەنگۆیەک هەبوو گوایە مەیجەری پیر، کە یەکانەیەکی سپیی کێش‌مامناوەندی شکۆدار بوو، خەونێکی بینیوە و دەخوازێت لەگەڵ ئاژەڵەکانی دیکەدا تاوتوێی بکات. هەمووان لەسەر ئەوە ڕێک کەوتبوون کە لەگەڵ ونبوونی سەروسەکوتی بەڕێز جۆنسدا، لە تەویلە گەورەکەدا کۆ ببنەوە. مەیجەری پیر (کە هەمیشە بەم ناوەوە گاز دەکرا و نازناوی خۆی جوانەکەی ویلینگتن بوو)، لە مەزراکەدا هێندە شکۆمەند و گرانقەدر بوو کە ئاژەڵەکان لارییان نەبوو لەوەی شەونخوونی بکێشن و

کاتژمێرێـک خەو لە چـاوی خۆیـان بتـارێنن تـاکوو گـوێ بـۆ قسەکانی ڕادێرن.

مەیـجەری پیـر لە سـووچێکی دواوەی تەویـلە گەورەکەدا و بەسـەر شـوێنێکی بەرزی چەشـنی سـەکۆوە، لەسـەر جێخەوە تەپکەکـاییەکەی خـۆی و لە بەر ڕووونـاکیی چرایەکـدا کە بە کـاریتەداری بنمـیچەکەوە هەڵواسـرابوو، پـاڵی لێـدابووەوە. تەمەنـی دوانـزە سـاڵان بـوو و بەم دوایـانەش کەمێـک قەڵەو بووبوو، بەڵام هێشتا سیمایەکی شکۆمەندانەی هەبوو و وێڕای ئەوەی کە هەرگیز شەفرەکانی نەبڕدرابوون، کەچی ویقارێکی نیان و دانایانەی هەبوو. بەر لەوەی ئاژەڵەکان بە دەستوور و شێوازی جیاوازی خۆیـان دەست بە هـاتن بکەن و شـوێنێکی گەرم و نەرم بۆ خۆیان خۆش بکەن، لەپێش هەموویانەوە سێ سـەگەکە *بلوبێل* و جێسـی و پینـچەر گەیشـتن. جا بەشـوێنیاندا بەرازەکـان هـاتن و دەسـتبەجێ لەسـەر کـای بەردەم سـەکۆکە گیرسـانەوە. مریشـکەکان لەسـەر لاشـیپی پەنجەرەکـان هەڵکورمان، کۆترەکان هەڵفڕینە سەر ستوونی بنمیچەکە، مانگا و مەڕەکـانیش لەپشـت بەرازەکـانەوە مـۆڵین[1] و کەوتـنە کـاوێژکردن. هەردووک ئەسـپی گالیسـکەکەش، بۆکسـەر و کلۆڤەر پێکەوە هـاتنە ژوور، زۆر هێواش و بە پارێزەوە سمە تـووکنە گەورەکـانی خۆیـان دادەنـا، نەبـادا ئـاژەڵێکی بچـووک لەنێو کاکەدا بپلیشێننەوە. کلۆڤەر ماینێکی بەهێزی نێوەندساڵ بـوو، بەڵام پـاش خسـتنەوەی چـوارەمین جوانـووی، ئەو گوڕوتین و لەشولارەی جارانی نەمابوو. هەرچی بۆکسەریشە،

---

[1] مۆڵین: پاڵکەوتن و حەسانەوەی گیاندار.

ئەسپێکی کەتەی بەهێز بوو، نزیکەی هەژدە پێ بەرز بوو و بەقەد دوو بارگیر کە بەیەکەوە بەسترابنەوە، هێزی هەبوو. هێڵێکی سپی تا سەر لووتی درێژ بووبووەوە و سیمایەکی گەپجاڕانەی پێ بەخشیبوو، هەرچەندە لەوانی دیکە زیرەکتر نەبوو، بەڵام بەهۆی کەسایەتیی سەنگین و توانای کارکردنی لەڕادەبەدەرییەوە، ڕێزێکی زۆری بۆ خۆی دەست خستبوو. پاش ئەسپەکان، *مۆریلی* بزنەسپی و *بنجامینی* گوێدرێژ هاتن. بنجامین پیرترین و گۆشەگیرترین ئاژەڵی مەزراکە بوو، تاکوتەرا وشەیەکی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دەگۆڕییەوە و ئەگەر دەمیشی بکردباوە، ئەوا بۆ گوتنی نوکتەیەکی بێتام و نەشاز بوو. بەردەوام پاتەی دەکردەوە کە خودا کلکێکی پێ بەخشیوە تا مێش و مەگەزی پێ دەربکات، بەڵام خۆزگە دەخوازێت نە کلکی هەبا، نە مێش و مەگەزێکیش لەئارادا بووایە. تاکە ئاژەڵی مەزراکە بوو کە هەرگیز پێنەکەنیبوو، کاتێکیش لە هۆکارەکەیان دەپرسی، دەیگوت شتێکی وای پێشچاو نەکەوتووە مایەی پێکەنین بێت. لەگەڵ ئەوەشدا، بێ ئەوەی بە ئاشکرا دەری ببڕێت، هۆگرییەکی زۆری بۆ بۆکسەر هەبوو. زۆرکات ڕۆژانی یەکشەممانیان پێکەوە لە پاوەنێکی بچووکی پشت ڕەزەکەدا بەسەر دەبرد، لە پەنای یەکەوە دەلەوەڕان و قسەیان پێکەوە نەدەکرد.

هەردوو ئەسپەکە لەوێ جێی خۆیان کردەوە و لەو کاتەدا پۆلێک بێچووەمراوی کە دایکیان لەدەست دابوو، بە قیقەقیقێکی نزم خۆیان بە تەویلەکەدا کرد و کەوتنە ئەمسەر و ئەوسەرکردن، تاکوو پەنایەکی پارێزراو و هێمن بۆ خۆیان بدۆزنەوە و نەبن بەژێر سمی ئاژەڵێکی دیکەوە. کلۆڤەر بە

سمی زلی جۆرە دیوارێکی بە دەوریاندا دروست کرد و ئەوانیش لەناویدا هەڵکورمان و خەو بردنییەوە. لە دواساتەکاندا، *مۆلی* نازداری گەمژە کە ماینێکی سپی بوو و گالیسکەکەی بەڕێز جۆنسی ڕادەکێشا، بە لەنجەولار و بەدەم کرۆشتنی کلۆە شەکرێکەوە، خۆی بە ژووریدا کرد. شوێنێکی لە پێشەوە بۆ خۆی گرت و کەوتە ڕاوەشاندن و نمایشکردنی یاڵە جوانەکانی، بەو نیازەی لەڕێی ئەو قردێلە سوورانەوەی کە پێوەی کرابوون، سەرنجی ئەوانی دیکە بە لای خۆیدا ڕابکێشێت. لەدوای هەموویانەوە پشیلەکە هات، وەک خووی هەمیشەیی خۆی و بۆ ئەوەی گەرمترین شوێن بدۆزێتەوە، چاوێکی بە چواردەوریدا گێڕا و دواجار خۆی ترنجاندە نێوان بۆکسەر و کلۆڤەر. لەوێ ئاسوودە و بێخەم بە درێژایی ماوەی قسەکانی مەیجەری پیر دەیمڕاند و گوێی بۆ تاقە وشەیەکیشی نەدەگرت.

هەنووکە بێ لە *مۆزسی* قەلەڕەشی ماڵی کە بەسەر ستوونێکی پشت دەرگەکەوە دەخەوت، هەموو ئاژەڵەکان لەوێ ئامادەبوون. کاتێک مەیجەری پیر بینیی هەموو ئاژەڵەکان شوێنی خۆیان خۆش کردووە و بە تامەزرۆییەوە چاوەڕوانی قسەکانین، قورگی ساف کرد و دەستی بە قسەکانی کرد:

«هەڤالان، بێ گومان ئاگاداری بابەتی ئەو خەونە سەیرەن کە دوێشەو بینیم، بەڵام سەرەتا دەمەوێ باسی شتێکی دیکەتان بۆ بکەم و دواتر بێمەوە سەر باسی خەونەکە. هەڤالانی ئازیز، پێم وایە تەمەن باقی نابێ تاکوو چەند مانگێکی دیکەش لەناوتاندا بمێنمەوە، هەر بۆیە بە ئەرکی خۆمی دەزانم کە ئەو زانست و ئەزموونەتان پێ بگەیەنم کە لە ژیاندا فێری

بووم. ژیانێکی دووردرێژم بەڕێ کرد و بە درێژایی ئەو ساڵانەش لە تەویلەکەمدا بە تەنیا دەمامەوە، هەر بۆیە کاتێکی زۆرم بۆ بیرکردنەوە هەبوو و دەبێ دانی پێدا بنێم کە لە هەر ئاژەڵێکی دیکەی سەر ئەم زەوییە، باشتر لە سرووشتی ژیان تێگەیشتووم. هەر سەبارەت بەم بابەتەشە کە دەمەوێ لەگەڵتان بدوێم. ئێستە هەڤاڵان، پێم بڵێن سرووشتی ژیانی ئێمە چییە؟ با خۆمانی لێ نەدزینەوە و ڕاشکاوانە دانی پێدا بنێین، ژیانی ئێمە ژیانێکی پڕ چەرمەسەری و تاقەتپڕوکێن و کورتە. کە دێینە دونیا تەنیا بەشی ئەوە خۆراکمان دەدەنێ کە بە زیندوویی بمانهێڵێتەوە و مردار نەبینەوە، ئەوانەشمان کە توانای کارکردنیان هەیە، تا دوا گوڕ و تینوتاوی جەستەیان ناچار بە کاری قورس دەکرێن. جا کە داشمانە کزی و کەڵکمان نەما، زۆر بێباک و بێبەزەییانە سەرمان دەبڕن. ئاخر ناوی یەک ئاژەڵم پێ بڵێن کە لەم ئینگلتەرایەی خۆماندا پێی نابێتە یەکەم ساڵی تەمەنییەوە و بزانێ پشوو و حەسانەوە چییە! وەک چۆن هیچ ئاژەڵێکی ئازادیش شک نابەین. ژیانی هەر ئاژەڵێک، یەک پارچە کولەمەرگی و کۆیلایەتییە و ئەمە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە.

بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە، ئایا ئەمە خواستی سیستەمی سرووشتە؟ ئاخۆ ئەم زەوییەی کە لەسەری دەژیین هێندە بەپیت نییە کە ژیانێکی شایستەمان بۆ دابین بکا؟ نەخێر هەڤالان، هەزار جار نەخێر! بە پێچەوانەوە، خاکی ئینگلتەرا خاکێکی بەپیتە و کەشوهەوایەکی لەبار و سازیشی هەیە، هەر بۆیە لە توانایدا هەیە بڕێکی زۆر لەوە زیاتر ئالیک بۆ ئاژەڵان دابین بکا کە لە ئێستادا هەیە. هەر ئەم مەزرا سادەیەی

خۆمـان، دەتـوانێ دوانـزە ئەسـپ، بیسـت مانگـا، سـەدان مەڕ بەخێو بکا و ژیانێکی وا شایستە و شـەرەفمەندانەیان بۆ دابین بکا، کە تا ئەم ساتە بە خەیاڵیشیاندا نەهاتبێ. کەوایە بۆچی تا ئێستە هەر لەم نەهامەتییەدا مـاوینەتەوە؟ چونکە بەشـی هەرە زۆری بەرهەمی ڕەنج و ماندووبوونمان لەلایەن مرۆڤەکانەوە بەهەدەر دراوە. بەڵـێ هەڤـالان، ئەمە چارەسـەری هەمـوو کێشـەکانمانە و هەرهەمووشـی لە یەک وشـەدا کۆ بـووەتەوە "مـرۆڤ". مرۆڤ تـاکە دژمنی ڕاسـتەقینەی ئێمەیە. مـرۆڤ لە هاوکێشـەکە بێنـنە دەرەوە، بـۆ هەتاهەتـایە ڕەگـی قـاتوقڕی و برسییەتی و ڕەنجی بێبەر لە بنەوە وشک دەبێ. مـرۆڤ تـاکە بوونەوەرە کە تەنیا بەکار دەبا و هیچ بەرهەم نـاهێنێ. لیترێک شیر بەرهەم ناهێنێ، هێلکە ناکا، زۆر لەوە لاوازترە هەوجاڕ[1] ڕابکێشـێ و لەوە خاوتریشـە کەروێشـکێکی پـێ بگیـرێ. لەگەڵ ئەوەشـدا پاشـای هەمـوو گیانـدارانە. گشـتیان لە بەرژەوەنـدیی خۆیدا بەکار دەهێنێ و لە بەرانبەریشدا، تەنیا هێندەیان دەداتێ کە لە برسـاندا نەمـرن و پاشماوەکەشـی بـۆ خـۆی هەڵدەگرێت. ئەوە ئـێمەین کە زەوی دەکێڵـین و هەر پەیـنەکەی ئێمەشـە کە زەوییەکە دەبوژێنێتەوە و بەپیتی دەکا، کەچی لەگەڵ ئەوەشـدا، بـێجگە لە پێسـتی ڕووتوڕەجاڵی خـۆمـان، خـاوەنی هـیچ شـتێک نـین. ئەی ئەو مانگایـانەی کە لە بەردەممـدان، پارسـاڵ چەنـد هەزار گـاڵۆن شـیرتان دا؟ ئەو هەمـوو شـیرەی کە دەکـرا گۆلکەکانتـانی پـێ بەخێـو بـکەن، بـۆ کـوێ چـوو؟ قـابیلە چـی بەسەرهاتبێ، دڵۆپ بە دڵۆپی بە قوڕگی دژمنەکانماندا چووەتە

[1] هەوجاڕ: ئامێری کێڵانی زەوی، گاسنی پێوە دەبەسترێت و دواتر هەرهەمووی دەبەسترێت بە گاوە تاکوو جووتی پێ بکرێت.

خوار. ئەی ئێوە چی مریشکینە، پارساڵ چەند هێلکەتان کرد و لەسەر چەندیان کڕکەوتن و بوونە جووچکە؟ ئەو هێلکانەی لێ دەربکەی کە تروکاون و بوونەتە جووچکە، هەرهەموویان براونەتە بازاڕ و پارەیەکیان بۆ جۆنس و پیاوەکانی پەیدا کردووە .با بێینە سەر تۆ کلۆڤەر، ئەو چوار جوانووەی کە خستنەوە و دەکرا ببنە پاڵپشت و پشتیوانی پیریت، چییان بەسەر هات؟ بێ گومان هەموویان لە یەکەم ساڵی تەمەنیاندا فرۆشران و هەرگیزاوهەرگیزیش چاوت پێیان ناکەوێتەوە. لەبەرانبەر ئەم چوار جوانووە و ڕەنج و مەینەتیی کارکردن لە کێڵگەکاندا، جگە لە گەوڕێک و جۆڕکی[1] پڕکا چیت قازانج کرد؟

کەچی سەرباری ئەم ژیانە پڕ چەرمەسەرییەشمان، مافی ئەوەمان نییە بە دەردی خۆمان ئەجەلمان بێت و سەر بنێینەوە. من وەک خۆم، ناهەقییە ئەگەر گلەیی و بۆڵەبۆڵ بکەم، چونکە یەکێکم لە ئاژەڵە بەبەختەکان. ئێستاکە دوانزە ساڵم و زیاد لە چوارسەد کۆڵە[2]م خستووەتەوە و دەکرێ بڵێم کە ژیانی ئاسایی هەر بەرازێک بەم جۆرەیە. بەڵام دواجار هیچ ئاژەڵێ لە تیغی تیژی چەقۆی مرۆڤەکان قوتاری نابێ. ئێوە ئەی ئەو بەرازە گەنجانەی کە لە بەردەممدا هەڵتروشکاون، ساڵێک نابا سەری دانە بە دانەتان دەخرێتە سەر کۆتەرەیەک و سەردەبڕدرێن. هەر لەبەر ئەم دڕندەیی و ترس و تۆقینەیە کە پێویستە هەموومان یەک بگرین، مانگا، بەراز، مریشک، مەڕ، هەموو ئاژەڵەکان. تەنانەت سەگ و ئەسپەکانیش

---

[1] جۆڕک: ئەو توورەکەیەیە کە بە قەپۆزی ئاژەڵەوە دەبەسترێت و ئالیکی تێدا دەخوات.

[2] کۆڵە: بێچووەبەراز، یاخود بێچووی ئاژەڵی دیکە.

چارەنووسێکی لەوە باشتر چاوەڕوانییان ناکا. تۆ ئەی بۆکسەر، ڕۆژێ دادێ کە ئەم شانوشەوکەوت و هێزی ماسولکانەت نامێنێ، ئەوکات جۆنس سووک و ئاسان دەتفرۆشێ بە قەسابێک و ئەویش دەتکوڵێنێ بۆ تانجییەکان. سەگەکانیش کە تەمەنیان هەڵکشا و سام و کەڵبەی تیژی جارانیان نەما، جۆنس یەکی خشتێکیان لە مل دەبەستێ و لە نزیکترین گۆمدا نووقمیان دەکا.

هەڤالان، ئێستە ئیدی وەک ڕۆژ لاتان ڕۆشن نییە کە هەرچی خراپەکاری و بەدبەختیی ژیانمانە لە ستەمکاری و ملهووڕی مرۆڤەکانەوە سەرچاوە دەگرێ؟ ئێوە بەس مرۆڤەکان لە کۆڵ خۆتان بکەنەوە، ئیدی هەموو بەرهەمی ڕەنج و ماندووبوونتان بۆ خۆتان دەبێ. کەم تا زۆر بە شەوێک دەتوانین سەربەست و دەوڵەمەند بین. کەواتە پێویستە چی بکەین؟ بۆ دەبێ شەو و ڕۆژ، بە جەستە و ڕۆح بۆ بووژاندنەوەی ڕەچەڵەکی مرۆڤەکان بکۆشین! هەڤالان، پەیامەکەی من *یاخیبوونە*. جا نازانم ئاگری ئەم یاخیبوونە کەی کڵپە دەسێنێ، ڕەنگە حەفتەیەکی دیکە بێ، یان سەد ساڵی دیکە! بەڵام وەک چۆن دەزانم ئەمەی ژێرم کایە، ئاوهاش دڵنیام کە درەنگ یان زوو یەکسانی دێتە ئارا. هەڤالان، زۆر پێویستە سەرنجتان لەسەر ئەم ئامانجە چڕ بکەنەوە و بە درێژایی تەمەنتان بەردەوام وەبیر خۆتانی بهێننەوە. لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە کە ئەم پەیامەم بە نەوەکانی دوای خۆشتان بگەیەنن، بۆ ئەوەی تا کاتی سەرکەوتن، نەوەیەکی هەڵگری ڕۆحی بەرەنگاری و یاخییێتی پەروەردە بکەین.

بیرتـان نەچـێ هەڤـاڵان، ورە بەر مەدەن و هەرگیـز نەنگـی نەنوێنن. بە هیچ قسەیەکی باقوبریقەدار و فریودەر نەخەڵەتێن. نەکەن گـوێ ڕادێـرن و بـڕوا بەو قسـانە بـکەن کە دەڵـێن ئاژەڵەکان و مرۆڤەکان بەرژەوەندیی هاوبەشیان پێکەوە هەیە و سەرکەوتنی هەر یەکێکیان پەیوەستە بە سەرکەوتنی ئەوی دیکەیانەوە. ئەمانە گشتی بێجگە لە کۆمەڵە درۆیەکی شاخدار هیچـی تـر نـین، مـرۆڤ تەنیـا لە خەمـی بەرژەوەنـدییەکانی خۆیدایە و بـاکی بە هـیچ گیانـدارێکی دیکە نییە. جـا بـا لەنێو ئێمەشدا یەکگرتوویی و برایەتییەکی پتەو هەبێت و تێبکۆشین.

دەنگەدەنگ و ژاوەژاوێکی زۆر لە تەویلەکەدا هاتە ئارا و ئەو کـاتەش مەیـجەر قسـەی دەکـرد، چـوار جرجـی گەورە لە کونەکانیان هاتنە دەر و لەسەر پاشەڵیان دانیشتن و گوێیان بۆ قسەکانی مەیجەر قوڵاخ کرد. سەگەکان دەمودەست بینییانن و جرجەکانیش بێ لەوەی بە پەلەپڕووزێ خۆیان بە کونەکانیاندا بکەنەوە، هیچ بژاردەیەکی دیکەیان شک نەبرد تاکوو گیانی خۆیانیـانی پـێ بپـارێزن. مەیـجەر وەک ئامـاژەیەک تـاکوو هەمووان بێدەنگ بن، سمی بەرزکردەوە و گوتی: «هەڤاڵان، لێرەدا بابەتێک هەیە کە دەبـێ بە لایەکیدا ببڕین. ئایا ئـاژەڵە کێوییەکانی وەک کەروێشک و جرج، دژمنن یان دۆست؟ با بیخەینە دەنگدانەوە. داوا لە ئامـادەبووان دەکەم ڕای خۆیـان دەربڕن، ئایا جرجەکان هاوڕێن؟»

دەنگ درا و ڕای زۆرینەش لەگەڵ ئەوەدا بوو کە جرجەکان وەک هـاوڕێ لە قەڵەم بـدرێن. تەنیـا چـوار دەنگیـان هـاوڕا نەبـوون، ئەوانـیش پشـیلە و سـێ سـەگەکە بـوون و، دواتـر دەرکەوت کە دەنگیـان بە هەردوولا دابـوو. مەیـجەری پیـر

درێـژەی بە قسـەکانی دا: «هەنـدێ وردەقسـەی دیـکە مـاون بیانکەم. دەیڵێمەوە و زۆر پێداگرانە جەختی لەسـەر دەکەمەوە، هەمیشـــە ئەرکـــی خۆتـــان کە دژایەتیکردنـــی مـــرۆڤ و ڕێگەکـانییەتی، لە یـاد بـێ. هەر بوونەوەرێـک لەسـەر دوو پـێ بڕوا دژمنە و ئەوەش کە لەسـەر چوار پێ دەڕوا، یـاخود بـاڵی هەیە، دۆستە. هەروەها بیرتان نەچێ لە کاتی شەڕکردن لەگەڵ مرۆڤەکانـدا پێویسـتە نەبیـنە جێگرەوەیـان و تەنـانەت ئەگەر بەسەریشیاندا سـەرکەوتین، ئەوا نـابێ هـیچ خـوو و ڕەفتـارێکی ئەوان بگـرین. نـابێ هـیچ ئاژەڵێـک لە خـانوودا بـژی، لەسـەر تەختەخەو بخەوێ، جل بپۆشێ، مەی بخواتەوە، تووتن بکێشێ، دەست لە پارەوە بدا، یاخود لە بازرگانیدا تێوە بگلێ. هەرچی خـــوو و ڕەفتێکـــی مـــرۆڤ هەیە، چەپەڵانە و نەگریســـە. لە سـەرووی هەمووشـیەوە، نـابێ هـیچ ئاژەڵێـک فەرمـان بەسـەر ئـاژەڵێکی دیکەدا بکـا و خـۆی بەسـەریدا بسـەپێنێ. گرنـگ نییە بەهێز بێ یـان لاواز، زیـرەک یـان سـادە و زەینکـوێر، دواجـار هەمووممان برای یەکین. وەک چۆن نابێ هیچ ئاژەڵێک ئاژەڵێکی دیکە بکوژێ و هەموو ئاژەڵەکان یەکسـانن. ئێسـتەش هەڤاڵان، بـا باسـی خەونەکەی دوێشـەوتان بـۆ بـکەم. هەڵـبەت نـاتوانم بۆتانی شی بکەمەوە. خەونم بە زەوییەکەوە بینی کە پێدەچوو هـیچ ئاسـەوارێکی مرۆڤـی بەسـەرەوە نەمـابێ، بەڵام هاوکـات ئەمە شـتێکی بیـر خسـتمەوە کە دەمێـک بـوو لەبیـرم کردبـوو. چەندان سـاڵ لەمەوبەر و ئەو کـاتەی کۆڵەیەک بووم، دایکم و هـاوڕێ مالۆسـەکانی، خوویـان پێـوە گرتبـوو و سـروودێکی کۆنیان بۆ دەچڕیم، کە تەنیا ئاواز و سێ وشـەی سـەرەتایان بیرمابوو. لەو کـاتەوە مـن بەو ئـاوازە ئاشـنام، بەڵام مـاوەیەکی

دووردرێژ بوو کە لە یادگەمدا سڕابووەوە، کەچی دوێشەو لە خەونەکەمدا هاتەوە یادم. جا سەیر لەوەدابوو کە وشە بە وشە هاتەوە بیرم، دڵنیام ئەم سروودە هەر لە دێرزەمانەوە لەلایەن ئاژەڵانەوە گوتراوە، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات و نەوە دوای نەوە بە تەواوی لەبیر کراوە. هەڤاڵان، ئێستە منیش ئەو سروودەتان بۆ دەخوێنمەوە. ئیدی بەرازێکی پیرم و نووزەم دەر نایە، بەڵام هەر ئەوەندەی ئاوازەکەم فێر کردن، ئیتر خۆتان باشتر دەتوانن بیچڕن. ناوی سروودەکەش "ئاژەڵانی ئینگلتەرا"یە.»

مەیجەری پیر قورگی ساف کرد و کەوتە چڕینی. دەنگی گڕ و نووساو بوو، بەڵام کەم تا زۆر باش دەیچڕی و ئاوەزەکەشی تێکەڵەیەک بوو لە سروودی کلێمێنتاین[1] و لا کوکەراچا[2]، هاوکات جۆشوخرۆشێکی زۆری تێدا بوو. سروودەکە بەم جۆرە بوو:

ئەی ئاژەڵانی ئینگلتەرا و ئێرلەند

ئەی ئاژەڵانی هەموو هەرێم و خاکێک

گوێ ڕادێرن مژدەتان دەمێ

سەبارەت بە داهاتوویەکی زێڕین

---

[1] Clementine

[2] سروودێکی نیشتیمانیی فۆلکلۆریی ئیسپانییە. لە مەکسیک زۆر بەناوبانگە و لە کاتی شۆڕشەکاندا گوتراوە.

درەنگ یان زوو ئەو ڕۆژە دێت

کە مرۆڤی ستەمکار تێی هەڵبدرێت

زەوییە بەپیتەکانی ئینگلتەراش

لەلایەن ئاژەڵانەوە بەڕێوە ببرێن

دەبێ ئەڵقەکانی لووتمان نەمێنن

زینەکانی پشتیشمان هەروا

لەغاو و ئاوزەنگەکانیش دەبێ بۆ ئەبەد ژەنگ هەڵبێنن

قامچییە بێبەزەییەکانیش چیدی شریخەیان نەیەت

دەوڵەمەندتر لەوەی بە مێشکدا بێت

گەنم و جۆ، گاڵ و کا

سێپەڕە، لۆبیا و گاچەوەندەر

لەو ڕۆژەدا دەبێ ببنە هی ئێمە

ئەو ڕۆژەی کە لە کۆت و بەند ئازاد دەبین

کێڵگەکانی ئینگلتەرا دەگەشێنەوە

ئاوەکانی زولاڵتر دەبن

شنەباکانی خۆشتر هەڵدەکەن

بۆ گەیشتن بە وەها ڕۆژێک، دەبێ بکۆشین
گەرچی بەر لە گەیشتنیشی بمرین؛
پێویستە مانگا و ئەسپ، قاز و قەل
هەمووان لەپێناو ئازادیدا بجەنگن

ئەی ئاژەڵانی ئینگلتەرا و ئێرلەند
ئەی ئاژەڵانی هەموو هەرێم و خاکێک
گوێ بگرن و مژدەکەم بڵاو بکەنەوە
سەبارەت بە داهاتوویەکی زێڕین

چڕینی ئەم سروودە، ئاژەڵەکانی خستە سەر جۆشوخرۆش و هەژانێکی زۆر. بە نزیکەی بەر لەوەی مەیجەری پیر بگاتە کۆتاییەکەی، ئەوان لە بەرخۆیانەوە کەوتنە گوتنی. تەنانەت بێمێشکترین ئاژەڵیان، ئاواز و چەند وشەیەکی سەرەتای سروودەکەی لە بەر کردبوو. هەرچی ئاژەڵە زیرەکەکانی وەک سەگ و بەرازیش بوون، لە چەند خوولەکێکی کەمدا تەواوی سروودەکەیان لە ناخی دڵەوە لە بەر کردبوو. دواتر و پاش چەند هەوڵێکی سەرەتایی، پێکڕا بە ئاواز و تۆنێکی هەماهەنگ و بەرز کەوتنە وتنەوەی سروودی ئاژەڵانی ئینگلتەرا و سەرانسەری مەزراکە دەنگی دەدایەوە. مانگا دەیبۆڕاند، سەگ دەیحەپەناد، مەڕ دەیباعاند، ئەسپ دەیحیلاند و مراوی

دەیقیقاند. هێندە بە سرووودەکە دڵخۆش و کەیفساز بوون کە پێنج جاران سەرکەوتووانە بەسەریەکەوە چرپییان و خۆ ئەگەر یەکێک لێی تێک نەدابان، ئەوا بە درێژایی شەو هەر دەیانگوتەوە.

بەڵام ئەفسووس هەراوهوریا و دەنگەدەنگەکە بەڕێز جۆنسی بەئاگا هێنا، بە پرتاو لە پێخەفەکەی هاتە دەر تاکوو چاوێک بەو دەوروبەرەدا بگێڕێ و بزانێت کە ئاخۆ ڕێوی بووە دزەی کردووەتە گۆڕەپانەکە یاخود نا. جا پڕی دایە تفەنگەکەی، کە هەردەم لە سووچێکی ژووری نووستنەکەیدا هەڵی سپاردبوو و کوێرانە شەش فیشەکی بە تاریکیدا تەقاند و ساچمەکان بەر دیواری تەویلەکە کەوتن. کۆبوونەوەی ئاژەڵەکان پشێویی تێکەوت و هەریەکەو بە لایەکدا بەرەو شوێنی حەوانەوەکەی تێی تەقاند. باڵندەکان فڕینە سەر ستوونەکان و ئاژەڵاکانی تریش لەسەر کاکە لێی مۆڵین. جا چەند ساتێک دواتر هەموو مەزراکە خەو بردبوویەوە.

## بەشی دووەم

سێ شەو دواتر، مەیجەری پیر لە شیرینەخەودا مرد و لاشەکەیان لە بەشی خوارەوەی باخەکەدا ناشت.

سەرەتای مانگی ئادار بوو. لە ماوەی سێ مانگی دواتردا، کۆبوونەوەی نهێنیی زیاتر ساز دەدرا. لێدوانەکەی مەیجەری پیر، تێڕوانینێکی نوێی سەبارەت بە ژیان بەخشیبووە ئاژەڵە وشیارەکان. نەیاندەزانی کەی یاخیبوونە پێشبینیکراوەکەی مەیجەری پیر سەر هەڵدەدات، هیچ هۆکارێکیشیان نەبوو تا وا بزانن لە سەروەختی تەمەن و ژیانی ئەواندا ڕوو دەدات، بەڵام بە تەواوی لایان ڕوون بوو کە ئەرکی سەرشانیانە وەک پێویست ئامادەکاریی بۆ بکەن. ئاسایی ئیشوکارەکانی ڕێکخستن و وانەوتنەوە کەوتبوونە ئەستۆی بەرازەکان، کە وەک زیرەکترین ئاژەڵی مەزراکە دەناسران. لەنێویشیاندا دوو یەکانەی لێهاتوو و ناوازە بە ناوی *ناپلیۆن* و *سنۆوبۆڵ*ەوە هەبوون، کە بەڕێز جۆنس بە ئەنقەست بۆ ئەوە گەورە و دابەستەی کردبوون، تاکوو بیانفرۆشێت. ناپلیۆن یەکانەیەکی قەلۆری دەموچاوگرژی مڕومۆچی *بێرکشایەر* بوو، تاکە *بێرکشایەر* بوو لە مەزراکەدا و تا بڵێیت کەمدووش، بەڵام کەسایەتییەکی سەنگین و بەسامی لەنێو ئاژەڵەکاندا هەبوو. سنۆوبۆڵ یەکانەیەک بوو لە ناپلیۆن چوست و چالاکتر، ڕەوانبێژ و خێراتر لە قسەکردندا، بەڵام وەک ناپلیۆن سامی نەبوو. نێرەبەرازەکانی دیکەش گشتیان دابەستە کرابوون بۆ

خواردن. دیارترینیان بەرازێکی بچووکی قەڵەو بوو بە ناوی *سکویلەر*، گوپخڕ و چاوپرتەپرتکەر، لەشێکی سووک و دەنگێکی بەرز و زایەڵەداری هەبوو. بەرازێکی بەدەموپل و وتاربێژێکی لێهاتوو بوو، کاتێکیش لە قسەکردندا باسی خاڵ یان بابەتێکی ئاڵۆزی دەکرد، دەکەوتە کلکەلەقێ و هەڵبەزین لە لایەکەوە بۆ لایەکی تر، ئەمەش بە جۆرێک لە جۆرەکان زۆر قایلکەرانە بوو. ئاژەڵەکانی دیکە لەبارەی سکویلەرەوە دەیانگوت دەتوانێت ڕەش بە سپی نیشان بدات.

ئەم سێ بەرازە ئامۆژگارییەکانی مەیجەری پیریان کردە سیستەمێکی فیکریی تەواو و ناویان نا ئاژەڵیزم. چەندان شەوی هەفتە، پاش ئەوەی بەڕێز جۆنس دەچووە خەوێکی قووڵەوە، لە تەویلەکەدا کۆبوونەوەی نهێنییان ساز دەدا و دەکۆشان بنەماکانی ئاژەڵیزم فێری ئەوانی دیکە بکەن. سەرەتا زۆر گەمژە و خەمساردانە کۆ دەبوونەوە. هەندێک ئاژەڵ لەبارەی دڵسۆزی و وەفاداریی بەڕێز جۆنسەوە دەدوان و وەک "گەورە" ناویان دەهێنا، یاخود لێرە و لەوێ لێدوانی بێمانایان دەدا، وەک: «بەڕێز جۆنس ئالیک و ئاومان دەداتێ و ئەگەر ئەو نەبێ، لە برسان دەتۆپین!» هەندێکی تریشیان دەیانپرسی: «کە ئێمە مردین، ئیدی چی ڕوو دەدا با بدا، چار بە جەهەنم!» یان: «باشە ئەگەر بڕیارە ئەم یاخیبوونە دواجار هەر ڕوو بدا، چ جیاوازییەکی هەیە کە هەوڵی بۆ بدەین یاخود نا؟» بەرازەکان بەدەست تێگەیاندنی ئاژەڵەکانەوە کە ئەم قسانەیان دژی بنەماکانی ئاژەڵیزمە، زمانیان سووابوو و مێشکیان کەوتبوو. گەمژانەترین پرسیار لەلایەن مۆلی

مایەسپییەوە کرا و پێش هەموو شتێک لە سنۆوبۆڵی پرسی: «ئەی دوای یاخیبوون شەکر دەمێنێ؟»

سنۆوبۆڵ بە زمانێکی ڕەق وەڵامی دایەوە: «نەخێر، لەم مەزرایەدا هیچ پێویستیمان بە بەرهەمهێنانی شەکر نییە. ئەوەش نەبێ، تۆ هیچ پێویستیت بە شەکر نابێ، چونکە هەموو ئەو کا و گاڵەیە[1] بۆ دابین دەکرێ کە دەتەوێ.»

مۆڵی دووبارە پرسیی: «ئەی ڕێگەم پێ دەدرێ قردێلەکان بە یاڵمەوە ببەستم؟»

سنۆوبۆڵ گوتی: «هەڤاڵ، ئەم قردێلانەی کە خووت پێوە گرتوون و بوونەتە خەو و خۆراکت، نیشانەی کۆیلایەتین. تێناگەی کە ئازادی زۆر لەم قردێلانە بەبەهاترە؟»

مۆڵی هاوڕای بوو، بەڵام وا پێدەچوو وەڵامەکەی بەدڵ نەبووبێت. سەرباری ئەمانەش، بەرازەکان دووچاری ئاستەنگییەکی قورستر بوونەوە لە سپیکردنەوەی درۆکانی مۆزسی قەلەڕەشی ماڵی. مۆزس، سیخوڕ و قسەبەری بەڕێز جۆنس و بڵاوکەرەوەی پڕوپاگەندە و ئەفسانەی بێمانا بوو، بەڵام قسەزانێکی چاکیش بوو. بە قسەی خۆی دەیگوت گوایە شارێک شک دەبات بە ناوی "کێوی نەبات" کە هەموو ئاژەڵان دوای مردنیان دەچنە ئەوێ. دەیگوت ئەم کێوە دەکەوێتە ئاسمان، کەمێ لە سەرووی هەورەکانەوەیە، هەر حەوت ڕۆژی هەفتە پشووە و سێپەڕە لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا سەوز دەبێت و پەرژینەکانیش کڵوە شەکر و کێکی *تووکەتان*

---

[1] گاڵ: هەرزن، دانەوێڵەیەکی ورد و لووسی بێپێزە، دەکرێت بە نان.

دەردەدەن. ئاژەڵەکان ڕقیان لە مۆزس بوو، چونکە تەنیا چیرۆکی هەڵیتوپەڵیت و ئەفسانەی بڵاو دەکردەوە و دەستی بۆ هیچ ئیشێک نەدەبرد، بەڵام هەندێکیان بڕوایان بە کێوی نەبات هەبوو. لەم نێوەندەشدا بەرازەکان گیریان خواردبوو و دەشیا بکەونە مشتومڕ و چەنەدان، تاکوو بڕوا بە ئاژەڵەکان بهێنن کە وەها شوێنێک بوونی نییە.

هەردووک ئەسپی عەرەبانەکە، بۆکسەر و کلۆڤەر، گوێڕایەڵترین و دڵسۆزترین شوێنکەوتووی بەرازەکان بوون. ئەم دووانە بێ لەوەی بەرازەکان وەک مامۆستا و سەرمەشقی خۆیان سەیر بکەن، مێشکیان بۆ هیچ شتێکی دیکە نەدەچوو. هەموو قسە و لێدوانەکانیان لێ وەردەگرتن و بە زمانێکی سادە، بە ئاژەڵەکانی دیکەیان دەگەیاندن. هەرگیز لە کۆبوونەوە نهێنییەکاندا دوانەدەکەوتن و هەمیشەش بە سروودی "ئاژەڵانی ئینگلتەرا" کۆتاییان بە کۆبوونەوەکان دەهێنا.

هەنووکە دەرکەوت کە یاخیبوونەکە زۆر لەوە ئاسانتر و زووتر سەری هەڵدا کە ئاژەڵەکان چاوەڕوانییان دەکرد. لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا بەڕێز جۆنسی گەورەی دڵڕەق، جووتیارێکی چاپووک بووە، بەڵام لەو دواییانەدا چارەڕەشییەک بەرۆکی گرتبوو. پاش دۆڕاندنی بڕێک پارە لە دادگە، لە جاران زیاتر دڵڕەق و بێهەست بووبوو و هاوکات زیاد لە پێویستیش دەیخواردەوە. تەواوی ڕۆژەکە لەسەر کورسییەکی *ویندسۆری* موبەق پاڵی دەدایەوە، ڕۆژنامەی دەخوێندەوە و دەیخواردەوە و جارجارەش پارچەنانێکی بە ئاوجۆ تەڕکراوی دەرخواردی مۆزس دەدا. پیاوەکانی جۆنس،

پاتاڵ و ناپاک بوون، هەرێز[1] کێڵگەکانی تەنیبوو، بیناکان دەبوو سەریان بگیرێت، پەرژینەکان بە تەواوی پشتگوێخرابوون و ئاژەڵەکانیش وەک پێویست ئالیکیان پێ نەدەدرا.

مانگی حوزەیران هات و کا و وێنجەکە کەم تا زۆر ئامادەی دروێنە بوو. لە ئێوارەیەکی ڕۆژی شەممەی چلەی هاویندا، بەڕێز جۆنس چووە ویلینگتن و بە جۆرێک خۆی بەدمەست کرد کە تا نیوەڕۆی ڕۆژی یەکشەممە نەگەڕایەوە. پیاوەکان لەگەڵ گزنگی بەرەبەیان مانگاکانیان دۆشین و تەنگەتاو و بێ ئەوەی خەمێک لە تێرکردنی ئاژەڵەکان بخۆن، چوونە ڕاوە کەروێشک. جا کە بەڕێز جۆنسیش گەڕایەوە، شەکەت و ماندوو یەکسەر خۆی بەسەر قەنەفەی ژووری میوانەکەدا دا و بە ڕۆژنامەی "هەواڵەکانی جیهان"ـی سەر ڕووخسارییەوە، خەوی لێ کەوت. بەم جۆرە ئاژەڵەکان بە سکی برسییەوە ئێوارەیان بەسەردا هات. لە کۆتاییدا نەیانتوانی لەوە زیاتر بەرهەڵستیی ئەو برسییەتییە بکەن. یەکێک لە مانگاکان بە قۆچ دەرگەی عەمبارەکەی شکاند و چووە ژووری، ئاژەڵەکانی دیکەش هەر یەک لە لای خۆیەوە کەوتە شکاندنی تەختە و سندووقەکان و دروست لەو کاتەشدا بەڕێز جۆنس بەئاگا هاتەوە. هێندەی نەبرد خۆی و چوار هاوەڵەکەی بە قامچییەکانی دەستیانەوە خۆیان کرد بە عەمبارەکەدا و بە ڕاست و چەپدا کەوتنە قامچیکاریکردنی ئاژەڵەکان. ئاژەڵە برسییەکان نەیاندەتوانی بەرگەی ئەم ئەشکەنجەیە بگرن، هەر بۆیە پێکڕا و بێ هیچ نەخشە و پلانێکی پێشوەختە، هەڵیان

---

[1] هەرێز: گژوگیای زیانبەخش کە بە شێوەیەکی سرووشتی دەڕوێت و زیان بە کشتوکاڵ دەگەیەنێت.

کوتایە سەر ئەشکەنجەدەران. جۆنس و پیاوەکانی لە هەموو لایەکەوە درانە بەر قۆچ و جووتە. چار نەمابوو و جڵەوی بارودۆخەکەیان لەدەست دەرچووبوو. لەوەوپێش هەرگیز هەڵسوکەوتی لەو جۆرەیان لە ئاژەڵەکانەوە نەدیتبوو. بەلەسەبوونی کتوپڕانەی ئەم بوونەوەرانە کە پێشتر ملکەچی شەلاقکاری و تێهەڵدان بوون، ئێستاکە زەندەقی پیاوەکانی بردبوو. پاش قەیرێک کە زانییان دەرەقەت نایەن و کار لە بەرگریکردندا نەماوە، تێیان تەقاند. خوولەکێک دواتر ئاژەڵەکان سەرکەوتووانە ڕاوەدوویان نابوون و هەر پێنجیان ڕاکەڕاک خۆیان گەیاندبووە ڕاستەڕێی گالیسکەکە.

خاتوو جۆنس لە پەنجەرەی ژووری نووستنەکەوە سەرەتاتکێیەکی کرد و کە فەرتەنەکەی دەرەوەی بینی، بە پەلەپڕووزێ چەند بەڵگەنامەیەکی ئاخنینە جانتاکەی و بێ تەقەوڕەقە لە ڕێگەیەکی دیکەوە بۆی دەرچوو. مۆزسیش لە نشینگەکەی خۆی هەڵفڕی و بە باڵەفڕێ و قاڕەقاڕەوە کەوتبووە شوێن خاتوو جۆنس. لەو کاتەدا ئاژەڵەکان جۆنس و پیاوەکانیان ڕاو نابوونە سەر ڕاستەڕێیەکە و دەروازە پێنج شیشییەکەیان بە شوێنیاندا داخستبوو. بەم شێوەیە و بێ ئەوەی ئاژەڵەکان بزانن خەریکی چین و چی دەقەومێ، یاخیبوونەکە سەرکەوتووانە ئەنجام درا. جۆنس تار نرا و مەزرای مەینەریش بووە موڵکی ئاژەڵەکان.

لە چەند خوولەکی سەرەتادا، ئاژەڵەکان بڕوایان بە بەختی باشی خۆیان نەدەکرد. بەر لە هەر شتێک کەوتنە غاردان بە دەوری مەزراکەدا، تاکوو لەوە ئەرخەیان ببن کە هیچ مرۆڤێک لە کونج و کەلەبەرێکدا خۆی حەشار نەداوە، جا بە غاردان

گەڕانەوە بیناکانی مەزراکە تاکوو شوێنەکە لە دواهەمین ئاسەوار و شوێندەستی قێزەون و چەپەڵی جۆنس پاک بکەنەوە. دەرگەی ژووری زین و تاق و تفاقەکەی ئەوسەری تەویلەکە شکێندرا، نەقیزە، ئەڵقەی لمۆز، زنجیری سەگ، ئەو چەقۆ تیژ و بێبەزەییانەی کە جۆنس بۆ خەساندنی بەراز و مەڕەکان بەکاری دەهێنان، هەمووی بە دیوارەکەوە داگیران. ڕیشوو و چاوبەست و ڕێشمە و جۆرکی ڕسواکەری ئالیکی قەپۆز و قامچییەکانیش، هەموویان تووڕدرانە ناو گووفەکی ئەو ئاگرەی کە لە مەیدانەکەدا گڕ درابوو. ئاژەڵەکان بەدەم تەماشاکردنی سووتانی قامچییەکان لە خۆشیاندا گەزگەز بالآیان دەکرد[١] و کەوتنە هەلەکەسەما. سنۆوبۆڵ هەستا و ئەو قردێلانەشی هاویشتنە نێو ئاگرەکە کە بۆ ڕازاندنەوەی کلک و یاڵی ئەسپەکان لە بازاردا بەکار دەهێندران.

جا گوتی: «پێویستە قردێلەکانیش وەک جل لە قەڵەم بدرێن، چونکە دروستکراو و پاشماوەی مرۆڤەکانن. ئاژەڵەکان پێویستە بە ڕووتوقووتی بسووڕێنەوە.»

کاتێ بۆکسەر ئەم قسانەی بیستن، کڵاوە پووشینەکەی خۆی کە هاوینان دەیتەپاندە سەری تاکوو مێش و مەگەز بە گوێیدا نەچن، داگرت و لەگەڵ پاشماوەی کەلوپەلەکانی دیکەدا هاویشتییە ئاگرەکەوە.

لە چاوترووکانێکدا، ئاژەڵەکان ئاسەواری هەموو ئەو شتانەیان سڕییەوە کە بەڕێز جۆنسیانی بیر دەهێنانەوە. پاشان

---

[١] گەزگەز بالآکردن؛ جێبەخۆنەگرتن؛ خەنیبوون؛ خۆشی و شادیی لەڕادەبەدەر.

ناپلیۆن هەموویانی ڕادایە عەمبارەکە و یەکی دوو ژەم گەنم و دانەویڵەی بەسەردا بەخشینەوە، لەگەڵ دوو پسکیت بۆ هەر سەگێک. دواتر لە نووکەوە بۆ نووک، حەوت جار سروودی "ئاژەڵانی ئینگلتەرا"یان چڕی و هەر یەکەو لە شوێنێک گیرسایەوە و وەک ئەوەی بە عەمراتیان نەخەوتبن، خەویان لێ کەوت.

وەک هەمیشە دەمەوکازیوە بەئاگا هاتن و کتوپڕ سەرکەوتنە مەزنەکەی خۆیان بیر هاتەوە و پێکڕا غاریان دایە لەوەڕگاکە. کەمێک لە خوار لەوەڕگاکەوە، تەپۆڵکەیەکی لێبوو کە بەسەر هەموو مەزراکەدا دەیڕوانی. ئاژەڵەکان چوونە سەر تەپۆڵکەکە و لە بەر پرشنگی خۆری ساف و دڵڕفێنی بەیانیدا، لە مەزراکەیان ڕوانی. بەڵێ، بووبووە هی ئەوان، هەر شتێک کە بە چاو دەیانبینی ئێستاکە هی ئەوان بوو! لە خۆشی و سەودای ئەو هەستەدا، کەوتنە خوولانەوە بە دەوری خۆیاندا، لەتاو جۆشوخرۆشی زۆر و تامەزرۆییدا، بەرزبەرز بازیان دەدایە هەوا و هەڵبەز و دابەزیان دەکرد. بەسەر ئاونگی ئەو ناوەدا تەپاوتلێیان دەکرد و دەمیان لە گژوگیای شیرنی هاوینان دەئاخنی. سمیان لە کلۆسنی[1] ئەو خاکە ڕەشە هەڵدەدا و بۆنە تیژ و خۆشەکەیان پڕ بە لووتیان هەڵدەمژی. دواتر وەک دووبارە چاوپێداخشاندنێک، گەشتێکیان بە دەوری مەزراکەدا کرد و بێ ئەوەی ورتەیان لێوە بێت، زەوییە کێڵدراوەکان، کێڵگەی کا و وێنجە، ڕەزەکان، گۆم و دەنگەکانیان پێوان. دەتگوت هەرگیز لەوەوپێش چاویان بەم

[1] گڵمەت، کلۆگڵ. کۆمای پێکەوەلکاوی گڵی وشکهەڵاتوو.

دیمەنـانە نەکەوتـووە و هەنـووکە بڕوایـان نەدەکـرد کە ئەمە گشتی بووەتە موڵکی ئەوان.

دواتـــر گەڕانەوە بیناکـــانی مەزراکە و لەبەردەم دەرگـــای خـانووەکەی جۆنسـدا بێدەنگ ڕامـان. خـانووەکەش بە هەمـان شـێوە بووبـووە مـوڵکی خۆیـان، بەڵام زاتیـان نەدەکـرد بچـنە ژووریٚ. پـاش تاوێـک، سنۆوبۆڵ و نـاپلیۆن بە شـان دەرگەی خانووەکەیان کردەوە و بە مارشێک ئاژەڵەکان پێکەوە چوونە ژوور. بە پــــارێزێکی زۆرەوە و لە ترســـــی ئەوەی نەکـــا بوونەوەرێک، شتێک لەو نـاوەدا بەئاگا بێنن و بێزاری بکەن، ڕێیان دەکرد. بە پێدزکە ژوور بە ژوور دەگەڕان و چپەی لیٚ دەرچـیٚ، نەیانـدەوێرا بە دەنگـی بەرز قسـە بـکەن، هاوکـات بە ترس و لەرزەوە لە شتومەک و کەلوپەلە سەیر و نامۆکانی ناو خانووەکەیـان دەڕوانـیٚ. تەماشـای تەخـتەخەوی نووسـتن و دۆشـەکە پەڕیـیەکەی سـەریان دەکـرد، ئاوێنەکـان، قەنەفەی دروسـتکراو لە مـووی ئەسـپ، فەرشـی کـارگە و بەردەچـاپی *شاژنە ڤیکتۆریا* بەسـەر ڕەفەی ئـاگردانی ژووری میوانەکەوە. خەریکبوو بە قادرمەکاندا دەهاتنە خوار کاتیٚ بینیان مۆڵی دیار نەمـاوە. بەشـوێن خۆیانـدا گەڕانەوە و بینییـان کە لە ژووری نووسـتنە نـاوازەکەدا مـاوەتەوە، پـارچەیەک قـردێلەی شـینی بەســەر مێـزی ئارایشــەکەی خـاتوو جۆنســەوە هەڵگرتـووە و لەئاست شـانەکانیدا ڕایگرتـووە و گەمژانە لەبەردەم ئـاوێنەکەدا لە خـۆی دەڕوانـیٚ. ئاژەڵەکـانی دیـکە تونـد لێـی هـاتنە پێش و سەرکۆنەیان کرد، ئینجا چوونە دەرەوە. چەند ڕانەبەرازێک کە لە مـــوبەقەکەدا هەڵواســـرابوون، بـــرانە دەریٚ و فرێـــدران. تەختەبەرمیلی ئـاوجۆکەی جۆنسـیش بە جـووتەیەکی بۆکسـەر

شکێندرا و بێ لەمانە ئاژەڵەکان دەستیان لە هیچی دیکەوە نەدا. دواتر بە کۆی دەنگ بڕیار درا کە خانووی مەزراکە وەک مۆزەخانەیەک بهێڵنەوە و هەمووان هاوڕا بوون لەسەر ئەوەی کە نابێت هیچ ئاژەڵێک تێیدا بژی.

ئاژەڵەکان نانی بەیانییان خوارد و لەلایەن سنۆوبۆڵ و ناپلیۆنەوە بانگهێشتی کۆبوونەوەیەک کران. سنۆوبۆڵ گوتی: «هەڤالان، کاتژمێر شەش و نیوە و ڕۆژێکی درێژمان لە پێشە. هەر ئەمڕۆ دەست دەکەین بە دروێنەی کاکە، بەڵام سەرەتا کێشەیەک هەیە کە پێویستە چارەسەری بکەین.»

لە کۆتاییدا بەرازەکان ئاشکرایان کرد کە لە ماوەی سێ مانگی ڕابردوودا و لەڕێی کتێبێکی ئەلفوبێ و گۆکردنەوە، کە هی منداڵەکانی جۆنس بووە و فڕێدراوەتە سەر گووفەکی کەلوپەلە سوتێندراوەکان، خۆیان فێری نووسین و خوێندنەوە کردووە. ناپلیۆن ناردی تا قوتوویێک بۆیەی ڕەش و سپیی بۆ بهێنن و بەرەو بەردەم دەروازەی پێنجشیشەیی سەر ڕاستەڕێکە کەوتە ڕێ. دواتر سنۆوبۆڵ (کە لە نووسیندا ڕکابەری نەبوو) فڵچەکەی خستە نێوان دوو قامکی سمی و "مەزرای مەینەر"ی بەسەر تابلۆی دەروازەکەوە کوژاندەوە و لە شوێنیدا "مەزرای ئاژەڵان"ـی نووسی. ئیدی لەوەودا ئەوە دەبووە ناوی مەزراکە. دواتر گەڕانەوە بۆ بیناگەلی مەزراکە و لەوێ سنۆوبۆڵ و ناپلیۆن ناردیان تاکوو پەیژەیەکیان بۆ بهێنن و بە دیواری تەویلە گەورەکەدا هەڵی سپێرن. دواتر بۆ ئاژەڵەکانیان ڕوون کردەوە کە لە ئەنجامی خوێندن و بەدواداچوونی وردی سێ مانگی ڕابردوویاندا، بەرازەکان سەرکەوتووانە توانیویان بنەماکانی ئاژەڵیزم لە حەوت یاسادا

هەڵبهێنجێنن. ئێستاکە ئەم حەوت یاسایە لەسەر دیوارەکە دەنووسرێن و دەبنە یاساگەلێکی جێگیر و نەگۆڕ کە پێویستە هەموو ئاژەڵێک تا دوا چرکەساتەکانی تەمەنی، پێیانەوە پابەند بێت. سنۆوبۆڵ کەمێک دژوار و قورس بەسەر پەیژەکەدا سەرکەوت (ئاخر ئاسان نییە بۆ بەرازێک هاوسەنگیی خۆی بەسەر پەیژەیەکەوە ڕابگرێت) و دەستی کرد بە نووسین، سکویلەریش چەند پلەیەک خوارتر، قوتووە بۆیەکەی بۆ ڕاگرتبوو. یاساکان بە پیتی گەورە و سپی، بە جۆرێک کە لە دووریی سێ یاردەوە بخوێندرێنەوە، بەسەر دیوارە قیراوییەکەوە نووسران.

**ئەمانە دەقی حەوت یاساکە بوون:**

١- هەر بوونەوەرێک لەسەر دوو پێ بڕوات دژمنە.

٢- هەر بوونەوەرێک لەسەر چوار پێ بڕوات، یاخود باڵی هەبێت، هاوڕێیە.

٣- نابێت هیچ ئاژەڵێک جل بپۆشێت.

٤- نابێت هیچ ئاژەڵێک لەسەر تەختەخەو بخەوێت.

٥- نابێت هیچ ئاژەڵێک خواردنەوەی کحوولی بخواتەوە.

٦- نابێت هیچ ئاژەڵێک ئاژەڵێکی دی بکوژێت.

٧- ئاژەڵان هەمووی یەکسانن.

یاساکان زۆر جوان و ڕێکوپێک نووسران، تەنیا لەبری ئەوەی بنووسن "هاوڕێ" نووسیبوویان "هاڕوێ" و پیتی

"س"ـەکەشیان هەڵگەڕاوە نووسـیبوو، بەڵام گرنـگ ئەوەبـوو گۆکرنەکەیان دروست بوو. سنۆوبۆل بۆ ئەوەی هەمووان بە باشـی لێـان تێبگەن، بە دەنگی بەرز خوێنـدنییەوە. ئاژەڵەکـان پێکـڕا سـەری قایلبوونیـان لەقانـد و زیرەکترینەکانیشـیان دەستبەجێ کەوتنە لەبەرکردنی یاساکان.

سـنۆوبۆل فلـچەکەی بەردایەوە و هـاواری کـرد: «یەڵـلا هەڤاڵان، دەستوبردی لێ بکەن بەرەو کێڵگەی وێنجەکە. با ئەمە بکەیـنە شـانازی و خـاڵێکی وەرچەرخـان و لە جـۆنس و پیاوەکانی خێراتر وێنجەکە بدروویـن.»

بەڵام لەم کـاتەدا هەنـدێک مانگـا کە مـاوەیەک لەوەوپـێش لە چـاو ون بووبـوون، کەوتـنە بۆڕانـدن. ئەوە بـۆ بیسـتوچوار کاتژمێری ڕێک دەچوو کە نەدۆشرابوون و گوانەکانیان وەخت بـوو بتەقن. بەرازەکـان پـاش کەمێـک بیرکـردنەوە ناردیـان تـا سـەتڵ بهێـنن و سـەرکەوتووانە مانگاکانیـان دۆشـین، هەر دەتگـوت سـمی ئەم بەرازانە بـۆ وەهـا کارێـک دروسـت کـراوە. هەر زوو پێنج سەتڵەشیری سـەربەکەفی توێژداریـان پڕ کردن و ئاژەڵەکانیش دۆشداماو لێیان دەڕوانین.

یەکێکیان گوتی: «چی لەم هەموو شیرە دەکەن؟»

یەکێک لە مریشکەکان وەڵامی دایەوە و گوتی: «هەندێ کـات جۆنس تێکەڵی دانەکەی دەکرد بۆمان.»

نـاپلیۆن لەبەردەم سـەتڵەکاندا قـوت بـووەوە و هەڵیـدایێ: «هەڤاڵان، بابەتی ئەم شیرە وێڵ کەن و گوێی مەدەنێ. ئەوەش چـارە دەکەیـن، بەڵام لە ئێسـتەدا ویـنجەکە گرنگتـرە. هەڤـاڵان!

سنۆوبۆڵ ڕێنوێنیتان دەکا و منیش کەمێکی دیکە دێم بە شوێنتاندا. دەی بجووڵێن، وێنجەکە چاوەڕوانتانە.»

بەم جۆرە ئاژەڵەکان بە ڕیز چوونە کێڵگەی وێنجەکە تاکوو دەست بە درووێنەی بکەن، بەڵام کاتێک ئێوارە گەڕانەوە، سەرنجیان دا شیرەکە بزر بووە.

## بەشی سێیەم

وای چەندە سەخت کۆشییان تا وێنجەکەن بدروون! بەڵام ئارەقەی نێوچەوانیان بە خەسار نەچوو و بۆیان قەرەبوو کرایەوە، چونکە بەرهەمی دروێنەکە زۆر لەوە بەکەڵک و گرنگتر بوو کە ئاواتیان بۆ دەخواست.

هەندێ کات ئیش‌وکارەکان سەختتر دەبوون، چونکە ئامێرەکانی کارکردن بۆ مرۆڤ دروست کرابوون نەک ئاژەڵ، هەر بۆیە بەکارهێنانی ئەو ئامێرانەی کە دەبوو لەسەر دوو پێ کاریان پێ بکرێت، بووبووە کۆسپێکی گەورە لەبەردەم ئاژەڵەکاندا. بەڵام بەرازەکان بە ڕادەیەک بیرتیژ و زیرەک بوون کە لە هیچ شتێکدا گیریان نەخوارد. هەرچی ئەسپەکانیش بوون، شارەزای ئینج بە ئینجی کێڵگەکان بوون و لە جۆنس و پیاوەکانی زیاتر دەسەڵاتیان بەسەر کاروبارەکانی دروێنە و کۆکردنەوەدا دەشکا. ئەوەی ڕاستی بێت بەرازەکان دەستیان بۆ هیچ ئیشێک نەدەبرد، تەنیا سەروکاریی ئاژەڵەکانیان دەکرد. بە پشتبەستن بە زیرەکیی لەڕادەبەدەریان، زۆر ئاسایی بوو کە ڕابەرایەتیی ئاژەڵەکان بکەوێتە ئۆباڵیان. بۆکسەر و کلۆڤەر بە مەبەستی بەکاربردنی دەزگای دروێنە و کۆکردنەوەکە، زین و تفاقیان لە خۆیان دەبەست و (هەڵبەت لەم ڕۆژانەدا هیچ نەقیزە و ڕیشوویەک پێویست نەبوو) بە هەنگاوی سست و مردووانە بە دەوری کێڵگەکاندا دەسووڕانەوە و بەرازەکانیش لە دوایانەوە تێیان دەخوڕین: «دەی هەڤاڵ بۆ پێشەوە» یان

«هــۆۆوو، بــۆ دواوە هەڤــاڵ!» ئیــدی بە هەر جۆرێــک کە بارودۆخەکە بیخواستبا. هەموو ئاژەڵەکان، گەورە و بچووک، لە دروێنە و کۆکردنەوەی وێنجەکەدا بەشدار بوون. تەنانەت مریشــک و مراوییەکــانیش تەواوی ڕۆژەکە بە بەر تیشــکی خۆری بەتینەوە کاریان دەکرد و بە دەنووک چەپکە وێنجەی بچووکیـان هەڵدەگرت. ئاقیبەت دوو ڕۆژ زووتـر لە جۆنس و پیاوەکانی، کۆتاییان بە دروێنە و کۆکردنەوەی وێنجەکە هێنا. هەرگیز مەزراکە بڕێکی وا زۆری وێنجەی بە خۆیەوە نەدیبوو، سەرباری ئەوەش یەک دەنکی بەفیڕۆ نەچوو، چونکە مراوی و مریشــکەکان بە چــاوە تیــژ و وردبینەکانیــان، دوا لاســکی بەجێمــاوی وێنجەکەیــان کــۆ دەکــردەوە و هــیچ ئــاژەڵێکی مەزراکەش تەنانەت قەپاڵێکی لێ نەخواردبوو!

تەواوی ئەو هاوینە، کاروبارەکانی مەزرا ئاسان و ڕێکوپێک وەک ئاو دەڕۆیشتن. ئاژەڵەکان کەیفساز و شاد بوون، وەک بڵێیــت هەرگیــز ڕۆژێــک لە ڕۆژان چــاوەڕوانی وەهــا شــتێک نەبــووبن. ئێســتە کە خــۆراکەکە بووبــووە مــوڵکی خۆیــان و لەلایەن خۆیـانەوە بەرهەم دەهێنـرا و هەر لەلایەن خۆشـیانەوە دەخـورا نەک خـاوەنە تەوسـن و پیسـکەکانیان، هەمـوو قەپـاڵە وێنجەیەک، تـامی تـایبەتی خۆی هەبـوو و بۆ ئەوان خۆشـی و گوڕوتینێکی نەبڕاوە بوو. بە ڕۆیشتنی مـرۆڤە بەلاشـخۆرەکان، ئێســتاکە بڕێکــی زیــاتری خــۆراک بەردەســت بــوو تــاکوو ئاژەڵەکـان لەســەری بـلەوەڕن، وەک چـۆن کـاتێکی زیاتریـان هەبــوو بــۆ حەســانەوە. بەڵام بەهــۆی کەمئەزموونییــانەوە، تووشی گێرەوکێشەی زۆر دەبوون، بۆ نمـوونە: دوابەدواکـانی ئەو سـاڵە و سـەروەختی هـاتنی وەرزی دروێنەی دانەوێڵە، بە

بۆنەی ئەوەی کە مەزراکە هیچ ئامێرێکی گێرەکردنی لێ نەبوو، ئاژەڵەکان ناچار دەبوو بە شێوازی کۆن دانەوێڵەکە پاماڵ بکەن و لەڕێی فووکردنەوە کا و دەنکەکان جیا بکەنەوە، وەلێ بەرازەکان بە زیرەکییەکەی خۆیان و بۆکسەر بە ماسوولکە بەهێز و تۆکمەکانی، هەردەم ئاژەڵەکانیان لە تەنگەژەی ئەم جۆرە کێشانە نەجات دەدا. بۆکسەر هەمووان لێی ڕازی بوون. تەنانەت لە سەردەمی جۆنسیشدا، هەر دڵسۆز و ماندوویینەناسانە کاری دەکرد، بەڵام هەنووکە بەقەد سێ ئەسپ ڕەنجی دەکێشا. ڕۆژانێک باری گرانی هەموو کاروبارەکانی مەزرا، کەوتبووە سەر شانە بەهێز و ڕەنجدەرەکانی بۆکسەر. هەر لە گزنگی دەمەوبەیانەوە تا کاتی داهاتنی شەو، لەو شوێنانەدا کە کارەکان سەخت بوون و بە ئاژەڵەکانی دیکە ڕانەدەپەڕێندران، بۆکسەر خەریکی ڕاکێشان و پاڵنان بوو. لەگەڵ کەڵەشێرەکە ڕێک کەوتبوو نیو کاتژمێر زووتر بەئاگای بهێنێت، بۆ ئەوەی بەر لە دەستپێکردنی کاتی ئاسایی کارکردنی ڕۆژ و لەو شوێنەی کە دەبێت زۆرترین کاری تێدا بکرێت، خۆبەخشانە هەندێک کار ڕاپەڕێنێت. لە وەڵامی هەموو کێشەیەک و لە کاتی هەر تەنگانەیەکدا، هەمیشە دەیگوت: «زیاتر کار دەکەم!»، بە جۆرێک کە ئەمە بووبووە درووشمی تایبەتیی خۆی.

بەڵام دواجار کەس زۆری لێ نەدەکرا و هەمووان بەپێی توانای خۆیان کاریان دەکرد. بۆ نموونە مراوی و مریشکەکان، لەڕێی کۆکردنەوەی دەنکە ونبووەکانی سەروەختی دروێنەدا،

پێنج بووشڵ[1] دانەوێڵەیان بۆ ئاژەڵەکان گەڕاندەوە. هیچ ئاژەڵێک دزی یاخود گلەیی لە بەشەخۆراکی خۆی نەبوو. ناکۆکی و دەمەدەمێ و چەلەحانێ کە بە شێوەیەکی ئاسایی بەشێک بوو لە ڕۆژانی ڕابردوویان، کەم تا زۆر بنبڕ بووبوو. هیچ ئاژەڵێک خۆی لە کارکردن نەدەدزییەوە، یان باشترە بڵێین بە نزیکەی هیچ ئاژەڵێک! مۆلیی ماین خەوقورس بوو و بەیانیان زوو بەئاگا نەدەهات، بە جۆرێک لە جۆرەکانیش لەو شوێنانەی کە بەردەڵان بوو و سمەکانی ئازاریان پێ دەگەیشت، بەر لە وادەی تەواوبوونی کار، خۆی دەدزییەوە و شوێنەکەی جێ دەهێشت. ڕەفتاری پشیلەکەش تا ڕادەیەک نامۆ و سەیر بوو. سەرنج درابوو کە ئەو کاتانەی کارێکی گرنگ دەهاتە پێش و دەبوو خێرا ڕابپەڕێندرێت، پشیلەکە لە هیچ لایەک بەدی نەدەکرا و دەتگوت زەوی قووتی داوە. چەندان کاتژمێر ون دەبوو و کەچی کاتی نانخواردن، کتوپڕ وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت، قوت دەبووەوە. بەڵام لە بیانووهێنانەوە و پاساودانی کارەکانی خۆیدا، هەمیشە دەستێکی باڵای هەبوو و بە جۆرێک دەیمیاواند کە دڵت بۆی دەسووتا و قورس بوو ئاژەڵەکانی دیکە بڕوای پێ نەکەن. هەرچی بنجامینی گوێدرێژی پیریش بوو، پێدەچوو پاش یاخیبوونەکە تۆزقاڵێک نەگۆڕابێت. وەک جاری جاران و ئەو کاتەی کاری بۆ جۆنس دەکرد، خاووخلیچک و کەللەڕەقانە ئیشوکارەکانی ڕادەپەڕاندن، نە خۆی لە کار دەدزییەوە، نە چرکەیەکیش خۆبەخشانە کاری زیادەی دەکرد. سەبارەت بە

---

[1] Bushel: پێوانەیەکە دەکاتە هەشت گالۆن، زیاتر بۆ دانەوێڵە و میوەجات بەکاردێت.

یاخیبوون و ئەنجامەکانیشی، هیچ لێدوان و بیروڕایەکی تایبەت بە خۆیی نەبوو، کاتێکیش لێیان دەپرسی کە ئاخۆ پاش ڕۆیشتنی جۆنس بەختەوەرتر نییە، لە وەڵامدا تەنیا دەیگوت: «گوێدرێژەکان تەمەنێکی درێژ دەژین، هیچ کامتان هەرگیز مەرگی گوێدرێژێکتان نەبینیوە.» ئاژەڵەکانیش ناچار دەبوو بە وەڵامە سەیر و لابەلاکانی قایل ببن.

ڕۆژانی یەکشەممە پشوو بوو و هیچ کارێک لەئارادا نەبوو. نانی بەیانی کاتژمێرێک درەنگتر دەخورا و، دوای نانی بەیانیش بۆنەیەک هەبوو کە هەموو هەفتەیەک بێ دواکەوتن ساز دەدرا. سەرەتا ڕێورەسمی هەڵکردنی ئاڵایان ئەنجام دەدا. سنۆوبۆڵ لە ژووری زین و تفاقەکەدا، ڕاخەرێکی سەرمێزی سەوزی خاتوو جۆنسی دۆزیبیەوە و بە بۆیەی سپی وێنەی قۆچ و سمێکی لەسەر نەخشاند. ئەم پارچە پەڕۆیە هەموو یەکشەممانێک وەک ئاڵا لە حەوشەی خانووەکەدا هەڵدەدرا. ئاڵاکە سەوز بوو و سنۆوبۆڵیش سەبارەت بە ڕەنگەکەی ڕوونکردنەوەی دا کە ئاماژەیە بە کێڵگە و زەوییە سەوزەکانی ئینگلتەرا و قۆچ و سمەکەش ئاماژە بوو بۆ ئەو کۆماری ئاژەڵانەی کە لە کاتی بڕانەوەی ڕەچەڵەکی مرۆڤەکاندا پێک دێت. پاش هەڵکردنی ئاڵا، ئاژەڵەکان پێکڕا بە ڕیز بۆ چاوپێکەوتنێکی گشتی کە زیاتر مەبەست لێی کۆبوونەوە بوو، دەچوونە تەویلە گەورەکە. لەوێ پلان بۆ کاروبارەکانی هەفتەی داهاتوو دادەڕێژرا، پێشنیارەکان دەخرانە بەرباس و بڕیارەکانیش تاوتوێ دەکران. هەمیشە بڕیارەکان لەلایەن بەرازەکانەوە دەردەچوون و ئاژەڵەکانی دیکەش هەر ئەوەندە تێدەگەیشتن کە دەنگ بدەن و نەیاندەتوانی خۆیان خاوەنبڕیار

بن. له لێدوان و وتاردانـدا، سـنۆوبۆڵ و نـاپلیۆن چـالاکترین ئاژەڵی نێو مەزراکە بوون. بەڵام ئەوە بووبووە جێی سـەرنج کە ئەم دووانە دانوویـــان پـــێکەوە نەدەکـــولا، هەرکامێکیـــان بڕیـــارێکی بـــدابا، ئەوی دیکەیـــان لە دژی دەوەســـتایەوە، بە کورتی ئەم دەیگوت ڕەشـە، ئەویـان دەیگـوت سـپییە. تەنـانەت ئەو کاتەش کە سـەبارەت بە دابینکردنـی پاوەنی پشت ڕەزەکە بۆ ئاژەڵانی خانەنشـینبوو گەیشـتنە ڕێککەوتنێک (هەڵبەت هیچ ئاژەڵێـک نەیـدەتوانی دژی بوەسـتێتەوە و لە باسـەکەدا خـۆی هەڵبقورتێنێـت) لە پرسـی دیـاریکردنی تەمەنـی گونجـاوی خانەنشـینبوون بەپێـی پـۆلی ئاژەڵەکـان، دەمەقڕێیەکـی گەرم لەنێویانـدا دروسـت بـوو. کۆبوونەوەکـان هەردەم بە چڕینـی سروودی "ئاژەڵانی ئینگلتەرا" کۆتاییـان دەهـات و شـەوەکەشـی بە تایبەت دادەنرا بۆ ئاهەنگگێڕان و کەیفـوسەفا.

بەرازەکـان هـۆدەی شـتومەک و تفاقەکانیـان وەک بارەگـای سـەرکردایەتی بۆ خۆیـان قۆرخ کـرد. ئێـواران تێیـدا خۆیـان بە ئاسـنگەری و دارتاشـی و فێربـوونی هەر هـونەرێکی دیـکەی پێویستەوە خەریک دەکرد، کە لەو کتێبانەوە فێری دەبوون کە لە خـانووەکەی جۆنسـەوە هێنابوویـانن. سـنۆوبۆڵیش لەولاوە سـەرپەرشـتیی ڕێکخسـتنی ئاژەڵەکـانی دەکـرد و نـاوی نـابوو کـۆمیتەی ئـاژەڵان و بـۆ ئەم مەبەسـتەش تەواو خەمخـۆر و تاقەتپڕوکێنانە کاری دەکرد. کۆمیتەی بەرهەمهێنانی هێلکەی بۆ مریشـکەکان پێـک هێنـا لەگەڵ خـولی کلکخـاوێنیی مانگاکـان، کـۆمیتەی دووبـــارە فێرکـــردنەوەی هەڤـــاڵە کێوییەکـــانیش (مەبەســت لێـی مــاڵیکردنی کەروێشــک و جرجەکــان بــوو)، هەروەهـا جـوولانەوەی خـووریی سپیوسـۆلتری مەڕەکـان و

چەنـدانی تـریش، لەگەڵ پۆلەکـانی وانەوتـنەوە و فێربـوونی خوێندنەوە و نووسین. لە هەموو ئەم پرۆژە و کۆمیتانەشدا، شکسـتخواردنێک هەبـوو. بـۆ نمـوونە هەوڵەکـانی کەویکردنـی ئـاژەڵە کێوییەکـان هەر زوو شکسـتی هێنـا، چـونکە هـیچ نەگۆڕابـوون و هەروەک پێشـتر ڕەفتاریـان دەکـرد، کـاتێکیش نەرمونیـان و بەڕێـزانە لەگەڵیـان دەجـووڵانەوە، بە دەرفەتیـان دەزانـی و هەلەکەیـان خـراپ دەقۆستەوە. پشـیلەکە چووبـووە کۆمیتەی دووبارە کەویکردنەوەی ئاژەڵە کێوییەکان و تا چەند ڕۆژێکیش کار و چالاکیی باشی تێیدا هەبوو. ڕۆژێـک بەسـەر بـانێکەوە بینییـان قسـە بـۆ هەنـدێک چۆلەکە دەکـات کە لێیەوە دوورن و دەسـتی پێیـان ناگـات. پێـی دەگـوتن گـوایە هەمـوو ئاژەڵەکان دۆست و ئەزیزی یەکن، پێویسـت بە تـرس ناکات و دەتـوانن بە ئـارامی لەنێـو چنگەکانیـدا هەڵکـورمێن، بەڵام چۆلەکەکـان هەروا لە دوورەوە مـانەوە و لێـی نزیـک نەکەوتنەوە.

وانەکـانی فێربـوونی نووسـین و خوێـندنەوە سـەرکەوتنێکی گەورە بـوون. لەگەڵ نزیکبـوونەوەی زسـتان، نـزیکەی هەمـوو ئاژەڵەکان لە خوێندنەوەدا تەقەتەقێکیان دەکرد.

هەرچی بەرازەکانیش بوون، پێشـوەختە بە باشـی دەیـانتوانی بنووسـن و بخـوێننەوە. سـەگەکان تـا ڕادەیەک لە خوێـندنەوەدا باش بوون، بەڵام بێ لە خوێندنەوەی حەوت یاسـاکە، ویسـتیان لەسەر خوێندنەوەی هیچ شتێکی دیکە نەبوو. مـوریڵی بزن، لە خوێـندنەوەدا کەمێـک لە سـەگەکان باشـتر بـوو، هەنـدێک کـات ئێواران ئەو ڕۆژنامانەی بۆ ئاژەڵەکـانی دیکە دەخوێندنەوە کە بەسـەر گـووفەی کەڵەکەکـراوی شـتوومەکەکانەوە

دۆزیبوونییەوە. بنجامین بەقەد بەرازەکان توانای بەسەر خوێندنەوەدا دەشکا، بەڵام هەرگیز تواناکانی خۆی دەرنەخستن. دەیگوت هیچ شتێک شایستەی خوێندنەوە نییە! کلۆڤەر فێری هەموو پیتەکان بوو، بەڵام نەیدەزانی بیانخاتە پاڵ یەک. بۆکسەر تا پیتی D فێر بوو. بەسەر زەوییەکەوە بە سمە زلەکانی A B C Dی دەنووسی و گوێقوت بەرەو دوا، لێیان ڕادەما و جاروبار کاکۆڵی ڕادەوەشاند و بە هەموو توانای خۆیەوە دەیکۆشی پیتی دواتری بیر بێتەوە، بەڵام هەرگیز سەرکەوتوو نەبوو. لێرە و لەوێ و لە هەندێک بۆنەدا فێری E F G H بوو، بەڵام تا ئەوانی لە بەر کردن، بۆی دەرکەوت کە A B C Dی بیر چووەتەوە. لە کۆتاییدا بڕیاری دا هەر لەسەر چوار پیتەکەی سەرەتا بمێنێتەوە و هەموو ڕۆژ جارێک یان دووان دەینووسینەوە، تاکوو بە تەواوی لە مێشکیدا بچەسپن. مۆلی بێجگە لە پیتەکانی ناوی خۆی، ڕەدی کردەوە فێری پیتەکانی دیکە ببێت. بە چڵ و لقەدار زۆر جوان و خۆشسەلیقە ناوی خۆی دەنووسی، جا هەر بۆ ڕازاندنەوە، گوڵێک یان دووانی لەسەر دادەنا و بە دەوریدا دەسووڕایەوە و تەماشای دەکرد.

ئاژەڵانی دیکەی مەزراکە، نەیانتوانی لە پیتی A زیاتر فێر ببن. دواتر دەرکەوت کە ئاژەڵگەلی گەمژە و زەینکوێری وەک مەڕ، مریشک و مراوییەکان تەنانەت نەیانتوانیوە حەوت یاساکەش بە جوانی لە بەر بکەن. دوای تێفکرینێکی زۆر، سنۆوبۆڵ گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە دەکرێت ئەم یاسایانە لە بیرۆکەیەکی سادە و کورتدا کۆ بکرێنەوە و بەم جۆرەیان لێ بکرێت: «چوارپێکان باشن، دووپێکان خراپن.» گوتی کە

ئەم درووشــمە بنەماکــانی ئــاژەڵیزمی لەخــۆ گرتــووە و هەر ئاژەڵێک پێیەوە پابەند بێت، لە کاریگەریی خراپی مرۆڤەکان بەدوور دەبێت. باڵندەکان سـەرەتا بیرۆکەکەیان ڕەد کردەوە، چــونکە ئەوانــیش تەنیــا دوو پێیــان هەبــوو، بەڵام هەر زوو سنۆوبۆڵ تەمـی گومـانی ڕەواندنەوە و بۆی سـەلماندن کە بە هەڵەدا چوون.

گـوتی: «هەڤاڵان، باڵەکان بـۆ پاڵنانن بەرەو پـێش و هەمـان کاری دەستەکانی مرۆڤ ناکەن، هەر بۆیە دەبێ حسێبی پێیان بـۆ بکـرێ. ئەوەی مــرۆڤ لە ئاژەڵەکــان جیــا دەکــاتەوە، دەستەکانیەتی کە بە یارمەتییان هەموو کارێکی پۆخڵ و گەند ئەنجام دەدا.»

باڵندەکان لە قسـە دووردرێژەکـانی سـنۆوبۆڵ تێنەگەیشـتن، بەڵام ڕوونکردنەوەکەیـان بە هەنـد وەرگـرت و هەمـوو ئـاژەڵە زەینکوێرەکـانی دیـکەش هــان دران تــاکوو لە دڵەوە، خۆیـان فێری درووشمە تازەکە بکەن. درووشـمی **چوارپێکـان خراپن، دووپێکان باشـن** لەوپەڕی دیواری تەویلەکە و بەسـەر حەوت یاسـاکەوە بە پیتـی گەورە نووسـرا. کاتێک ئاژەڵەکـان لە نـاخی دڵەوە فێــری بــوون و وەک نــاوی خۆیــان لە بەریــان کــرد، مەڕەکان هۆگرییەکی زیاتریان بۆ ئەم درووشـمە پەیدا کرد و پەیتاپەیتـا و ئەو دەمەی بەسـەر کێڵگەکـانەوە دەمـۆڵین، پێکـڕا دەکەوتـنە باعانـدنی: «چـوارپێ کـان خـراپن، دووپێکـان باشـن! چوارپێکـان خـراپن، دووپێکـان باشـن.» چەنـدان کـاتژمێر بەم جۆرە بەردەوام دەبوون و هەرگیز لێی بێزار نەدەبوون.

ناپلیۆن بە هیچ شێوەیەک ڕای لەسەر کۆمیتەکانی سنۆووبۆڵ نەبوو. دەیگوت پەروەردە و فێرکردنی لاوان زۆر لە خۆخەریکردن بەوانەوە گرنگترە کە تەمەنێکیان هەیە. پاش دروێنەکردنی وێنجەکە، جێسی و بلوبێڵ هەر زوو ترەکین و نۆ توولەی دڕ و بەهێزیان خستنەوە. هەر ئەوەندەی لە شیری دایکیان بڕان، ناپلیۆن دووری خستنەوە و گوتی کە خۆی بەرپرسیارییەتیی پێگەیاندن و پەروەردەکردنیان لە ئەستۆ دەگرێت. ئینجا بردنییە هەورەبانێک کە تەنیا بە پەیژە و لەڕێی هۆدەی شتومەکەکانەوە دەکرا ئاژەڵێک پێیان بگات، لەوێ دوور لە چاو و سەرنجی هەمووان هێشتنییەوە و هێندەی نەبرد مەزراکە بوونی ئەم تووتکەسەگانەی لە بیر کرد.

نهێنی و بەسەرهاتی شیرە ونبووەکە هەر زوو پەردەی لەسەر هەڵماڵرا. دەرکەوت کە هەموو ڕۆژ تێکەڵ بە دانەوێڵەی بەرازەکان کراوە. وەرزی ڕنینی سێو هات و سەوزەگیای باخەکە یەک پارچە بە سێوی باخستوو، داپۆشرابوو. ئاژەڵەکان خۆشیخۆشی وایان دانابوو ئەم سێوانە بە یەکسانی بەسەریاندا دابەش دەکرێن. بەهەرحاڵ، ڕۆژێک فەرمان درا کە دەبێت ئەم سێوە باخستووانە کۆ بکرێنەوە و ڕەوانەی ژووری تفاقەکان بکرێن تاکوو بەرازەکان لێیان سوودمەند ببن. بەم بۆنەیەوە هەندێک لە ئاژەڵەکان کەوتنە مرەمر و دەربڕینی ناڕەزایی، بەڵام کەڵکی نەبوو. چونکە پێشوەختە بەرازەکان لەسەر ئەم کارە ڕێک کەوتبوون، بە ناپلیۆن و سنۆوبۆڵیشەوە. جا دواتر سکویلەریان نارد تا ڕوونکردنەوەی پێویست بداتە ئەوانی دیکە.

سکویلەر دەستی بە قسەکانی کرد و گوتی: «هەڤالانی هێژا، هیوادارم بەو جۆرە بیرتـان نەکردبێتەوە کە ئێمەی بەراز ئەم کارە لەپای خۆپەرستی و بەرژەوەندیی چاوچنۆکانەی خۆماندا دەکەیـن؟ ئێمەی بەرازەکـان زۆربەمـان ئەسڵەن خۆشـمان لە سێو نـایەت و یەکێکیشیان خۆمم! بەڵام ئامانجی سـەرەکیمان لەم کـارەدا، پاراسـتنی تەندروسـتیی بەرازەکـانە. شـیر و سـێو (هەڵبەت ئەمەی کە دەیڵێم زانسـتییەن سـەلمێندراوە هەڤـالان) جۆرە ماددەیەکیـان تێدایە کە بـۆ هێشـتنەوەی بەرازەکـان بە سـاغ و سـەلامەتی زۆر پێویسـتە. ئێمەی بەراز، زیـاتر کـار بە مێشـکمان دەکەیـن نەک بە جەسـتەمان. هەرچـی کاروبـارێکی ڕێکخســـتن و بەڕێـــوەبردنی ئەم مەزرایە هەیە، کەوتـــووەتە ئەسـتۆی ئێمە. شـەو و ڕۆژ بێ وچـان چاودێریتـان دەکەیـن و هەر لەبەر *خـاتری* چـاوە جوانەکـانی ئێوەشـە کە شـیر و سـێو دەخـۆین. دەزانـن ئەگەر ئێمەی بەراز لەم ئەرکەمانـدا شکسـت بێنـین چـی دەقەومـێ؟ جـۆنس دەگەڕێـتەوە! بەڵـێ هەڤـالان، گومانتان نەبێ کە جۆنس دەگەڕێتەوە.» سکویلەر بە دەنگێکی مەیـلەو گریانـاوییەوە دەیمرخانـد، لەمســـەر بـۆ ئەوســـەر هەڵدەبەزی و کلکەسووتێی دەکرد. «دڵنیام هیچ یەک لە ئێوە نایەوێ چاوی بە چڕوچاوی جۆنس بکەوێتەوە، وایە؟»

ئێستە تاکە شتێک کە هەموو ئاژەڵەکان لەسەری کۆک بوون، ئەوەبوو کە بە هیچ شێوەیەک نەیاندەویست جۆنس بگەڕێتەوە. کـاتێکیش ئەم خاڵەیـان بە تەواوی لا ڕوون بـووەوە، هیچیـان نەمـــایەوە بـــۆ گـــوتن. گرنگیـــی هێشـــتنەوەی بەرازەکـان لە تەندروســـتییەکی باشـــدا، پرســـێکی نکـۆڵیلێنەکـراو بـوو. بەم جۆرەش بێ هیـچ ڕێککەوتـن و پرسوخواسێک، قایل بـوون کە

شـیر و سـێوه باخسـتووەکان (هەورەهـا بەری سـێوەکانیش لە کاتی ڕنیندا) گشتی بە تەنیا بۆ بەرازەکان بێت.

## بەشی چوارەم

ئاخر و خۆری هاوین، هەواڵی ڕووداوەکەی مەزرای ئاژەڵان بە نیوەی شاردا بڵاو بووەوە. هەموو ڕۆژێک سنۆوبۆل و ناپلیۆن پۆلە کۆترێکیان دەنارد، تاکوو تێکەڵ بە ئاژەڵانی مەزراکانی دراوسێیان ببن و چیرۆکی یاخیبوونەکەیان بۆ بگێڕنەوە و ئاوازی سروودی "ئاژەڵانی ئینگلتەرا"یان فێر بکەن.

لەم کاتەشدا، بەڕێز جۆنس زۆربەی کاتەکانی بە دانیشتن لە مەیخانەی ڕێد لایۆن*ی ویلینگتنەوە بەسەر دەبرد. خۆ گەر بیزانیبا یەکێک گوێی بۆ دەگرێت، ئەوا دەکەوتە دەردەدڵ و باسکردنی ئەو کارەساتەی کە لەلایەن کۆمەڵێک ئاژەڵی هیچ-لەباردانەبووەوە بەسەری هێنرا و لە موڵکەکەی خۆی دەرپەڕێنرا. خاوەن مەزراکانی دیکە بەزەییان پێیدا دەهاتەوە، بەڵام سەرەتا یارمەتییەکی ئەوتۆیان نەدا. لە ناخی دڵەوە هەر یەکەیان خۆی بۆ ئەوە مەڵاس دابوو تاکوو بزانێت ئاخۆ ناتوانێت بەدبەختی و شکستەکەی جۆنس لە بەرژەوەندیی خۆیدا بشکێنێتەوە. بەڵام لە بەختی نێوچەوانی جۆنس، بار و گوزەرانی دوو مەزراکەی دراوسێی، هێندە باش نەبوو. یەکێکیان ناوی *فۆکسوود* بوو، مەزرایەکی گەورە و پشتگوێخراو بوو، داهێزراو و کۆن، هەرێز یەک پارچە زەوییەکانی تەنیبوو و کێڵگەکانیشی بێپیت مابوونەوە و

پەرژینەکانیشی هێندە لە بارێکی خراپدا بوون کە پیاو پێی شەرم بوو باسیان بکات. بەڕێز پیلکینگتن خاوەنی ئەم مەزرایە بوو، کابرایەکی خۆشڕەفتار و خانەدان بوو و بەپێی گونجان و لەباریی وەرزەکان، زۆربەی کاتەکانی لە ڕاوەماسیدا بەسەر دەبرد. مەزراکەی دیکەشیان ناوی *پینچفیلد* بوو، بچووک و ڕێکوپێکتر بوو. بەڕێز فریدریک خاوەنی بوو، کابرایەکی تەوسنی بیرتیژ بوو، هەمیشە لە کێشە و داوای قەزایی دادگەوە تێوەگلابوو و بەوە ناوی ڕۆیشتبوو کە لە مامەڵەکردندا کابرایەکی زۆر مێشکپڕ و کەڵلەڕەقە. ئەم دوو خاوەنمەزرایە بە ڕادەیەک ڕقیان لە یەک بوو، کە ئەستەم بوو تەنانەت بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆشیان پێک بێن.

لەگەڵ ئەوەشدا یاخیبوونەکەی مەزرای ئاژەڵان، ترسی خستبووە دڵی هەردووکیان و زۆر لە خەمی ئەوەدابوون کە ئاژەڵەکانیان هیچ سەرەداوێکیان سەبارەت بەم یاخیبوونە چنگ نەکەوێت. سەرەتا بە جۆرێک مامەڵەیان دەکرد، وەک ئەوەی فشەیان بەو بیرۆکەیە بێت کە ئاژەڵەکان خۆیان کاروبارەکانیان بەڕێوە دەبەن. دەیانگوت: «دوو هەفتەی تر نابا هەر هەمووی کۆتایی دێ و ئەم باسە سەر دەنرێتەوە!» لە مێشکی خۆیاندا وایان دانابوو کە ئاژەڵەکانی مەزرای مەینەر (سوور بوون لەسەر ئەوەی بە مەزرای مەینەر ناوی ببەن، چونکە ناوی مەزرای ئاژەڵانیان پێ هەزم نەدەکرا) هەمیشە لەنێوان خۆیاندا ناکۆکی و شەڕیانە و تاوناتاوێکیش یەکێکیان لە برساندا دەتۆپێت. وەختێکیش کات تێپەڕی و ئاژەڵەکانی مەزرا لە برساندا نەتۆپین، فریدریک و پیلکینگتن ئاوازی قسەکانیان گۆڕی و کەوتنە بڵاوکردنەوەی

پڕوپاگەنـدەی ئەو ئافـاتەی کە لەنێـو مەزرای ئاژەڵانـدا بـڵاو بووەتەوە. گوایە ئاژەڵەکان لەوێ خەریکی کردەی مرۆڤخۆرین و بە نـــاڵی ســــوورەوەبوو ئەشــکەنجەی یەکــدی دەدەن و هاوبەشـی بە مێینەکانیـان دەکەن لەگەڵ یەکتریـدا! دەیـانگوت: «دە بڕۆن دەی، کە لە دژی یاساکانی سرووشت دەوەستنەوە، ئاوهاتان بەسەردێ.»

هاوکــات ئەم قســەوباس و چیرۆکــانە هەرگیــز بە تەواوی بڕوایان پێ نەدەکرا. دەنگۆی مەزرایەکی دڵڕفێن و خۆش کە لە ئاســەواری مــرۆڤ پــاک کــراوەتەوە و ئاژەڵەکــان تێیــدا کاروبارەکانی خۆیان بەڕێوە دەبەن، بووبووە بنێشتەخۆشـەی سەر زاران و بە شێوەی جیاجیا و تەمومژاوی بڵاو دەبووەوە، نـزیکەی تەواوی ئەو سـاڵە گونـدەکانی دەوروبەر کەوتـنە بەر لێشاوێکی یاخیبوون. گاکان کە هەمیشـە ملکەچ و ئەڵقەلەگوێ بـوون، لەپـڕ بەلەسـە و هـار بـوون، مەڕەکـان پەرژینەکانیـان شـکاندن و هەمـوو وێنجەکەیـان حەپەلـووش کـرد، مانگاکـان سـەتڵەکانیان قڵپ کـردنەوە و ئـاژەڵگەلی ڕاویـش سـوارەکانی ســەر پشــتیانیان گلانــدن. لە هەمووشــی گرنگتــر، ئــاواز و وشـەکانی سـروودی "ئـاژەڵانی ئینگلـتەرا" لە هەمـوو کـون و قوژبنێکدا دەناسرانەوە و وەک برووسکە بە گشت لایەکدا بڵاو دەبـوونەوە. مرۆڤەکـان کاتێـک گوێیـان لەم سـروودە دەبـوو، بەدەسـت خۆیـان نەبـوو و نەیانـدەتوانی ڕق و قینـی ناخیـان بشارنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا وا خۆیان نیشان دەدا کە بەلایانەوە شـتێکی تەواو قۆڕیـات و بێمانـا بێـت. هـیچ تێنەدەگەیشـتن و دەیـــانگوت: «ئـــاخر ئـــاژەڵان چـــۆن دەتـــوانن ئەم قســـە هەلەقومەلەقانە بڵێنەوە!» بەسەر هەر ئاژەڵێکیشدا بچوونایە کە

مژوولّی وتنەی ئەم سروودە بووبا، شەلاقکارییان دەکرد. کەچی سەرباری ئەم هەموو چاوسوورکردنەوە و دژایەتییە، سروودەکەیان پێ کپ نەدەکرایەوە. ڕەشیشەکان[1] لەنێو پەرژینەکاندا سروودەکەیان دەجریواند و کۆترەکانیش بەسەر لقوپۆپی دارنارەوەنەکانەوە[2] دەیانگماند، بە جۆرێک کە تێکەڵ بە ژاوەژاو و تەقەتەقی ئاسنگەران و زەنگی کڵێسە بووبوو. کاتێکیش مرۆڤەکان گوێیان لێوەی دەبوو، بە دزییەوە وەک بی دەلەرزین و داهاتووی شووم و خراپی خۆیانیان تێیدا بەدی دەکرد.

سەرەتای مانگی تشرینی یەکەم بوو، دانەوێڵەکە درووێنە کرابوو و کۆ کرابووەوە و بڕێکیشی گێرە کرابوو، پۆلە کۆترێک کە بە ئاسماندا دەسووڕانەوە، تۆقیو و حەپەساو کتوپڕ لە مەیدانی مەزراکەدا نیشتنەوە. جۆنس و پیاوەکانی، لەگەڵ دوانزە پیاوێکی کێڵگەکانی دیکەی فۆکسوود و پینچفیلددا، گەیشتبوونە دەروازە پێنجشیشییەکە و بە گالیسکەڕێکەدا بەرەو مەزراکە دەهاتن. یەکی تێلایەکیان[3] بە دەستەوە بوو، جۆنس نەبێ کە بە خۆی و تفەنگەکەیەوە پێشڕەویی دەکرد. قابیلە بۆچی هاتبن! بێ گومان هەوڵی گەڕاندنەوەی مەزراکە دەدەن.

---

[1] ڕەشیشە: باڵندەیەکی سترانبێژی چکۆلەیە.

[2] نارەوەن، وەزن، ناروەند: دارێکی بێبەرە، بە قەدی ڕەش، لقوپۆپی جوان، چێوی ڕەق و پتەو، گەڵای ددانە ددانەی چڕ و گوڵی نێر و مێیەوە ناسراوە.

[3] دارێکی لووسی ڕاستە و لە گورگە درێژترە.

دەمێک بوو چاوەڕوانی شتێکی لەو جۆرە دەکرا و هەموو ئامادەکارییەکی پێویستیش بۆ بەرپەرچدانەوەیان گیرابووە بەر. جا بە بۆنەی ئەوەوەی کە سنۆوبۆڵ کتێبێکی تایبەت بە هێرشەکانی قەیسەری لە خانووی مەزراکەدا دۆزیبووەوە و دواتریش خوێندبوویەوە، بووبووە سەردەستەی یەکەکانی بەرگری. هەر زوو فەرمانی دەرکرد و لە چەند خوولەکێکی کەمدا هەموو ئاژەڵەکان شوێنی خۆیانیان گرت.

هەر کە مرۆڤەکان لە بیناگەلی مەزراکە نزیک کەوتنەوە، سنۆوبۆڵ یەکەم هێرشی خۆی کرد. هەموو کۆترەکان کە ژمارەیان سیوپێنج دانە بوو، هەڵفڕین و بەسەر سەری پیاوەکانەوە خوولیان دەدا و ڕیقنەبارانیان دەکردن، کاتێکیش پیاوەکان بە کۆترەکانەوە سەرقاڵ بوون، قازەکان کە لەپشت پەرژینەکەوە خۆیان مەڵاس دابوو، دەرپەڕین و کەوتنە دەنووکئاژنکردنی پووزی پیاوەکان. هەڵبەت ئەمە تەنیا سووکەمانۆڕێک بوو، تاکوو پشێوییەک لەنێویاندا دروست بکەن. پیاوەکان هەر زوو بە تێلاکانیان قازەکانیان سەرکوت کردن و لەم کاتەدا سنۆوبۆڵ دووەم هێرشی خۆی کرد. موریل و بنجامین و مەڕەکان، سنۆوبۆڵیش لە دوایانەوە، هەموو پێکەوە هێرشیان برد و لە هەموو لایەکەوە دایاننە بەر قۆچ، ئەمە لە کاتێکدا بنجامین بە سمە بچووکەکانی خۆیەوە پیاوەکانی دابوونە بەر جووتە. بەڵام دووبارە پیاوەکان بە تێلاکانی دەستیان و پێڵاوە بزمارییەکانیانەوە، زۆر لەوە سەختگیر و بەهێزتر بوون کە بەو ئاسانییە کۆڵ بدەن. لەپڕ بە هاوارێکی سنۆوبۆڵ کە ئاماژەی کشانەوە بوو، هەموو

ئاژەڵەکـــــان دەســــــتیان هەڵگـــــرت و بە دەروازەکەدا بەرەو مەیدانەکە غاریان دا.

پیاوەکان هاواری سەرکەوتنیان لێوە بەرز بووەوە. دروست بەو جـۆرەی کە وێنایــان کردبــوو، بینیــان کە دژمنەکانیــان خەریــکە هەڵــدێن و ئەمــانیش تەنگەتــاو و قیــنلەدڵ شــوێنیان کەوتــن. ســنۆوبۆڵیش هەر ئەمەی دەویســت. هەر ئەوەنــدەی هەموویـان پێیـان خسـتە مەیـدانەکە، سـێ ئەسـپەکە و مانگـا و هەمــوو بەرازەکــانی دیــکەش کە لە گەورەکەدا خۆیــان مــات دابوو، بە پڕتاو هاتنە دەر و دایان بەسەر پیاوەکاندا. سنۆوبۆڵ ئاماژەی کرد تاکوو هێرش بکەن و خۆیشی یەکڕاست بەرەو ڕووی جۆنس ملی نا. جۆنس سنۆوبۆڵی بینی کە بەرەو ڕووی دێت، تفەنـگەکەی هەڵبڕی و تەقەی لـێ کـرد. گـوللەی تفەنـگ، دەزوولەخوێنێکی بەسـەر پشـتی سـنۆوبۆڵەوە دروست کـرد و لەو نێوەندەشـدا مەڕێـک بـووە قوربـانی. سـنۆوبۆڵ بـێ ئەوەی هـیچ بسـڵەمێتەوە و بکەوێتە شەلەشـەل، قورسـایی هەر پـانزە ستۆنەکەی[1] لەشـی کێشـا بە لاقەکـانی جۆنسـدا. جۆنس بەسـەر تەپۆڵکەیەک شـیاکەدا کەوت و تفەنـگەکەی لە دەست بەربـوو. بەڵام جــارێ لە کــوێیەتی! تــۆقێنەرترین کۆســپی بەردەمیــان بۆکســــەر بــــوو، جەربەزە و بەهێــــز لەســــەر پاشــــووی هەڵدەســـتایەوە و بە نــاڵە ئاســـنینەکانی ســـمییەوە، هێرشـــی دەکردنە سەر. یەکەم لێدان بووە نسیبی کەللەی کوڕێژگەیەکی کێڵگەی فۆکسوود و بێگیان لە نێو قوڕ و لیتەکەدا کەوت. لەو ساتەدا هەنـدێک لە پیاوەکـان تێلاکانیـان فڕێدان و هەوڵیـان دا

---

[1] Stone: یەکەیەکـی پێـوانەیە، دەکـاتە ١٤ پاوەنـد، یـاخود ٦.٣٥ کیلۆگرام.

هەڵبێن. بە تەواوی هەترەشیان چووبوو و هێندەشی نەبرد ئاژەڵەکان پێکرپا بە دەوری گۆڕەپانەکەدا ڕاوەدوویان نان. قەپاڵ و قۆچ و جووتەیان لێ دەدان و دەیانشێلان. ئاژەڵێک لەو مەزرایەدا نەمابووەوە کە لەئاست خۆیەوە تۆڵەیان لێ نەستێنێتەوە، تەنانەت پشیلەکەش کتوپڕ بەسەر بانەکەوە دەرپەڕی و بەسەر شانی گاوانێکەوە[1] گیرسایەوە، چڕنووکەکانی چەقاندنە ملی و کابرا نەعرەتەیەکی ئازاری لێوە بەرز بووەوە. کاتێک دەرفەتیان بۆ ڕەخسا، پیاوەکان بەوە سوپاسگوزار بوون کە بواری ئەوەیان هەبێ تێی بتەقێنن و تیرئاسا بە ڕاستەڕێکەدا هەڵبێن. پێنج خوولەک دواتر دروست بەو جۆرەی کە هاتن، بەڵام ئەم جارەیان سەرشۆڕ و بەزیو، ڕاوەدوو نران و پۆلە قازێکیش بە قیقەقیق شوێنیان کەوتبوون و پووزیان دەنووکئاژن دەکردن.

هەموویان هەڵهاتن، دانەیەکیان نەبێت. کە گەڕانەوە گۆڕەپانەکە، بینییان بۆکسەر بە سمەزلەکانی ئەو کوڕێژگەیە دەجووڵێنێت کە مردووئاسا لەسەر دەم و لەنێو قوڕ و لیتەکەدا درێژ بووبوو، دەیویست هەڵی بگێڕێتەوە، بەڵام کوڕێژگەکە لە جێی خۆی نەدەبزووت.

بۆکسەر بە خەم و دڵێکی تەنگەوە گوتی: «مردووە! من هیچ نیازی وەها کارێکم نەبوو. هەر بیرم نەبوو کە ناڵە ئاسنینەکانم لە سمدان. ئاخر ئێستە کێ بڕوام پێ دەکا کە بە ئەنقەست نەمکوشتووە؟»

---

[1] Cowboy، گاچەڕێن.

سنۆوبۆڵ کە هێشتاش خوێنی لێ دەچۆڕا، گوتی: «هەڤاڵ، ئەوەندە هەستیار مەبە. ئیدی شەڕە و تاکە مرۆڤی باش، ئەوەیە کە مردووە!»

فرمێسک لە چاوی بۆکسەردا قەتیس مابوو و پاتەی کردەوە: «من نامەوێ هیچ گیانەوەرێک بکوژم، با مرۆڤیش بێت!»

ئاژەڵێکی دیکە گوتی: «مۆلی لە کوێیە؟»

ئەوەی ڕاستی بێت مۆلی بزر بووبوو. بۆ ساتێک هەمووان دڵیان کەوتە خورپە و ترسان پیاوەکان بەلایەکیان بەسەردا هێنابێت، یاخود لەگەڵ خۆیاندا پەلکێشیان کردبێت. دواجار لە تەویلەکەی خۆیدا دۆزییانەوە، لە عەزرەتدا سەری بەژێر کاکەدا کردبوو و دەرکەوت هەر لەگەڵ تەقینی یەکەم گوللەدا چوار دەست و پا تێی تەقاندووە. ئەو ئاژەڵانەی چووبوون مۆلی بدۆزنەوە، کاتێ گەڕانەوە گۆڕاپانەکە، ڕوانییان کوڕێژگەکە دیار نەماوە، توومەز ئەمە تەنیا کاس بووبوو و هەر کە هاتبووەوە سەر خۆی، یەکسەر ڕای کردبوو.

ئاژەڵەکان بە جۆشوخرۆشێکی زۆرەوە کۆ بوونەوە و هەریەکەیان لەجێی خۆیەوە بە دەنگی بەرز کەوتە پیاهەڵدان و باسکردنی قارەمانێتی و نەبەردیی خۆی لە شەڕەکەدا. گەرماوگەرم ئاهەنگێکی سەرکەوتنیان ساز دا. جا ئاڵا هەڵکرا و سروودی "ئاژەڵانی ئینگلتەرا"شیان چەند جارێک پاتە کردەوە. دواتر ئەو مەڕەیان لە مەراسیمێکی شایستەدا بەخاک سپارد کە بووبووە قوربانی و دارگوێژێکیشیان لەسەر گۆڕەکەی ناشت. هەر لەوێ و لە گۆڕستانەکەدا، سنۆوبۆڵ وتارێکی دا و

گوتی که گەر پێویست بکات، ئەوا لەپێناو مەزرای ئاژەڵاندا پێویستە هەموو ئاژەڵێک ئامادەگیی گیان بەختکردنی تێدا بێت.

بە کۆی دەنگ، ئاژەڵەکان بڕیاریان دا مەدالیایەکی شانازی دروست بکەن، "مەدالیای ئاژەڵی پاڵەوانی پلەیەک" بەخشرایە سنۆوبۆڵ و بۆکسەر. ئەم خەڵاتەش لە کانزایەکی مسی دروستکرابوو (ڕاستییەکەی تەنیا کۆمەڵێک کانزایی ڕازێنەرەوەی زینی ئەسپی کۆن بوون کە لە ژووری تفاقەکاندا دۆزرابوونەوە) دەبوو لە ڕۆژانی یەکشەممە و پشوودا لە ملی بکەن. هەروەها مەدالیای "ئاژەڵی پاڵەوانی پلەدوو"ش بەخشرایە مەڕە شەهیدبووەکە.

قسەوباس و ورتەورتێکی زۆر کرا سەبارەت بەوەی کە ڕووبەڕووبوونەوەکە پێویستە ناو بنرێ چی. لە کۆتاییدا گوتیان مادام بۆسەکە لە گەوڕەکەدا نرایەوە، با ناوی بنێین شەڕی گەوڕەکە. دواتر تفەنگەکەی بەڕێز جۆنسیان لە قوڕولیتەکەدا دۆزییەوە و دەیانزانی کە زەخیرەیەکی زۆری گولله لە خانووەکەدا هەیە، هەر بۆیە بڕیار درا تفەنگەکە لە بەردەم دارئاڵاکەدا وەک نموویەکی تۆپهاوێژی هەڵبواسرێ و هەموو ساڵێک دوو جار بتەقێنرێت. جارێک لە دوانزەی تشرینی یەکەم، ساڵیادی شەڕی گەوڕەکە، جارەکەی تریش لە چلەی هاویندا، ساڵیادی یاخیبوونەکە.

## بەشی پێنجەم

لەگەڵ هاتنی زستاندا، مۆڵی زیاتر بووە مایەی کێشە. هەموو سپێدەیەک لە ئیشکردن دوادەکەوت و هەموو جارێکیش بیانووی ئەوەی دەهێنایەوە کە زۆر خەوتووە، یاخود گلەیی و گازندەی ئازارێکی شاراوەی لە جەستەیدا دەکرد، کەچی کە دەگەیشتە سەر نانخواردن نەیدەدا بەبەر کەسەوە! لەگەڵ هەموو بیانوویەکیشدا، یەکسەری خۆی لە کار دەدزییەوە و ڕای دەکردە سەر ئەستێڵەکە، لەوێ بە ویقارێکی گەمژانەوە دەوەستا و لە ئاوەکەدا تەماشای وێنەی خۆی دەکرد، بەڵام دەنگۆی شتێکی ترسناکتر لەگۆڕێدا بوو. ڕۆژێکیان کاتێک مۆڵی دەمبەپێکەنین و شاد بەدەم بادانی کلکە درێژەکەیەوە بە کێڵگەکەدا پیاسەی دەکرد و خەریکی جووینی چەپکێک کا بوو، کلۆڤەر بردییە پەنایەکەوە و گوتی: «مۆڵی، بابەتێکی گرنگ هەیە کە پێویستە لەگەڵتدا باسی بکەم. بەرەبەیانی ئەمڕۆ بینیم لەو پەرژینەت دەڕوانی کە مەزرای ئاژەڵانی لە فۆکسوود جیا کردووەتەوە. بەهەرحاڵ، گەرچی زۆر دوور بووم لێتەوە، بەڵام لەوە دڵنیام کە چاوەکانم بینییان. بینیم قسەی لەگەڵ دەکردی و تۆش ڕێگەت دەدا دەست بە قەپۆزتدا بهێنێ. ئەمە یانی چی مۆڵی؟»

مـۆڵی کەوتە سـمکۆڵان و گێرەکردنـی زەویـیەکە و گـوتی: «نەخێر ڕاست نییە، ئەو کاری وای نەکردووە، ڕووم ڕەش بێ ئەگەر کاری وام کردبێ!»

«مۆڵی! سـەیری ناوچاوانم بکە. سـوێند دەخـۆی ئەو پیـاوە دەستی بە قەپۆزتدا نەدەهێنا؟»

مـۆڵی پـاتەی کـردەوە: «شـتی وا نیـیە!» بەڵام نەیـدەتوانی ڕووبەڕوو سـەیری کلـۆڤەر بکـات و سـاتێک دواتـریش، بەرەو کێڵگەکان کەوتە غاردان.

بیـرۆکەیەک بە مێشـکی کلـۆڤەردا ڕابـووورد. بـێ ئەوەی هـیچ بەوانی دیکە بڵێت، ڕاست چووە تەویلەکەی مۆڵی و لەوێ بە سـمی کـاکەی لادا. بینیـی تەپـۆڵکەیەک کلـووە شـەکر و چەنـد قردێلەیەکی ڕەنگاوڕەنگ شاردراونەتەوە.

سـێ ڕۆژ دواتـر مـۆڵی دیـار نەمـا. بـۆ مـاوەی چەنـدان هەفتە کەسـیان نەیـانزانی کە سـەری خـۆی بـۆ کـوێ هەڵگرتـووە، تـا کۆترەکـان هەواڵیـان هێنـا کە لە لایەکـی دیـکەی ویلینگتـنەوە بینیویـانە. گوتیـان: «لەنێـوان سـتوونی گالیسـکەیەکی جـوانی ڕەش و سـووری بەردەم مەیخانەیەکـدا وەسـتابوو. پیـاوێکی قەڵەوی دەموچـاو سوورەسـپیش بە پـانتۆڵێکی خەتـخەت و پووزەوانەوە[1] کە هەر لە مەیفرۆش دەچوو، دەستی بە لمۆزیدا دەهێنا و کلووە شـەکری بە دەمییەوە دەکرد. کوڵکەکەی تـازە بڕابـووەوە و قردێلەیەکیشـی بە دەوری کاکۆڵیـدا ئالانـدبوو،

[1] Gaiters: پـووزەوانـە، زەنگــاڵ، دۆلاخ، نـەوارێــکـە لـە پــارچـەی ئـەسـتـوور دروسـت دەکـرێ و لـە خـوار ئـەژنـۆوە بـەسـەر شـەرواڵ و پانتۆڵدا دەبەسترێ و تا بان کەوش دادەپۆشێ.

هێنــدە شــاد و کەیفخــۆش بــوو کە لە پێســتی خۆیــدا جێــی نەدەبووەوە.» دوای ئەمە، ببڕای ببڕ هیچ ئاژەڵێک باسی مۆڵیی نەکردەوە.

لەگەڵ هـاتنی مـانگی کـانوونی دووەمـدا، کەشـێکی تـووش و ناسـازیش دەسـتی پێکرد. زەوی سـەراپا وەک ئاسـن بووبـووە شەختە و هیچ کارێک لە کێڵگەکاندا نەدەکرا. گەلێک کۆبوونەوە لە تەویلە گەورەکەدا بەستران و بەرازەکانیش کـاتێکی زۆریـان بۆ پلاندانان بۆ وەرزی داهاتوو تەرخان کرد. هەمووان لەسـەر ئەوە کـۆک بـوون کە مـادام بەرازەکـان زیرەکترینــی نێــو ئاژەڵەکانن، دەبێ هەموو بڕیارەکانی تـایبەت بە ڕامیاریش هەر لەلایەن ئەوانەوە بــــدرێن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــــدا، دەبـــوو بڕیارەکانیان لەلایەن ئاژەڵەکانەوە هەڵبسـەنگێندرێن و دەنگیـان لەسـەر بـدرێت. خـۆ ئەگەر ناکۆکییەکـانی نێـوان نـاپلیۆن و سـنۆوبۆڵ نەبـان، ئەوا دەکـرا ئەم ڕێکخسـتنە ئەنجـام و بەرهەمێکـی زۆر باشـتری هەبێـت. ئەم دووانە لە هەر کـات و جێ و ڕێیەکدا بۆیـان بکرابـا، لە دژی یەک دەوەسـتانەوە. گەر یەکێکیـان پێشـنیاری بکردبـا زەوییەکـی زیـاتر بـۆ چانـدنی جـۆ بکێڵـدرێت، ئەوا ئەوی تریـان لە ڕقـی ئەم پێشـنیاری دەکـرد کە ڕووبەرێکی زیاتری زەوی بۆ چاندنی گـاڵ بکێڵدرێت. خـۆ گەر یەکێکییـان لە دەمـی دەربچووبـا و بیگوتبـا زەوییەکـی وا و وا هەر دەڵێی خـودا بـۆ بەرهەمهێنـانی کەلەرم دروسـتی کـردووە، ئەوا ئەوی تریان قوت دەبـووەوە و دەیگوت ئەم زەوییە تەنیا بۆ گێزەر دەشـێت، گەرنـا کەڵکـی تـوورێکی قـوڕاویی نییە! هەر یەکەیــان شــوێنکەوتووی خــۆی هەبــوو و چەنــد گفتوگــۆ و دەمەقاڵێیەکی گەرم و توندیش لەنێوانیانـدا گـوزەرا. لە زۆربەی

کۆبوونەوەکانـــــدا، ســـــنۆوبۆڵ بەهـــــۆی زمانپـــــاراوی و قســـەزانییەکەی خـــۆیەوە، زۆربەیـــانی دەهێنـــایە ژێـــر بـــاری قســـەکانی، بەڵام نـــاپلیۆن ناوبەنـــاو لە بەدەســـتهێنانی پاڵپشـــتی ئەوانی دیکەدا لێهاتووتر بوو و لەگەڵ مەڕەکانیشدا زۆر نێوانی خۆش بوو. بەو دواییانە مەڕەکان لە وەخت و ناوەختدا، بێوادە "چوارپێکـــان خـــراپن، دووپێکـــان باشـــن"یـــان دەگـــوتەوە و کۆبوونەوەکانیـــان پـــێ دەشـــێواند. ســـەرنج درابـــوو تەنیـــا لە ســـاتەوەختە چارەنووســـسازەکانی لێـــدوانەکانی ســـنۆوبۆڵدا دەکەوتـــنە وتـــنەوەی "چوارپێکـــان خـــراپن، دووپێکـــان باشـــن." سنۆوبۆڵ خوێندنەوەیەکی وردی بۆ چەند ژمارەیەکی کۆنی ڕۆژنامەکـــانی *وەرزێـــر و ئاژەڵـــدار* کردبـــوو، کە لە خـــانووی مەزراکەدا دۆزیبوونییەوە و پڕ بوون لە نەخشەڕێگەی داهێنان و پێشـــکەوتن. شـــارەزا و بڕوابەخۆبـــووانە قســـەی لەســـەر *جۆگەهێنان* و *ئالیکی زستانە* و *کووتی کیمیایی فۆسفات* دەکرد و ڕێگە و بەرنـــامەیەکی ئـــاڵۆزی خســـتبووە بەردەم ئاژەڵەکـــان تـــاکوو هەمـــوو ڕۆژ و لە شـــوێنی جیاجیـــادا شـــیاکەکەیان ڕۆ بـــکەنە کێڵگەکـــان و بەم جـــۆرەش مانـــدووبوون و ئـــارەقەی گواستنەوەکەیان لە کۆڵ دەبووەوە. ناپلیۆن هیچ بەرنامەیەکی تایبەت بە خۆیی نەبوو، بەڵام ڕاشکاوانە دەیگوت کە سنۆوبۆڵ تەنیا کـاتی خـۆی بەفیـڕۆ دەدات و هیـچ بە هیـچ ناکـات. بەڵام هیچ یەک لەم دژایەتی و ناکۆکیانەیان بەقەد نـاکۆکیی بنیادنـانی ئاشەباکە سەخت نەبوو.

زۆر دوور نـــا و لە لەوەڕگە بەریـــنەکەی نزیـــک بینـــاکەڵی مەزراکەدا، تەپۆڵکەیەک هەبوو کە بەرزترین خـاڵ بـوو بەســەر مەزراکەدا بڕوانێت. سنۆوبۆڵ چاوێکی پێدا خشاند و گوتی کە

لەم شوێنە باشتریان دەست ناکەوێت تاکوو ئەو ئاشەبایەی لەسەر درست بکەن کە بە پشتبەستن پێی، دەکرێت دینەمۆیەک بخرێتە کار و کارەبا بۆ مەزراکە دابین بکرێت. بەم پێیەش تەویلەکان ڕۆشن دەبنەوە و لە زستانیشدا گەرم دادێن، هەروەها مشاری کارەبایی و دەڕاسە و ئامێری چەوەندەرهاڕین و دۆشینی مانگاکانی پێ دەخرێتە کار. ئاژەڵەکان تەقەی سەریان دەهات، پێشتر ئەم شتانەیان نەبیستبوون و بەلایانەوە سەیروسەمەرە بوون (چونکە مەزراکەیان کۆن بوو و تەنیا ئامێرە سەرەتایی و گرنگەکانی تێدا دەست دەکەوتن.) دۆشداماو و سەرسام گوێیان هەڵخستبوو و سنۆوبۆڵیش وێنەی ئەو ئامێرە ناوازانەی دەهێنایە پێشچاویان کە دەکرا لەبری ئەوان و کاتێک مژووڵی دەرسخوێندن و لەوەڕینن، کارەکان ڕاپەڕێنن.

هێندەی نەخایاند و لە ماوەی چەند هەفتەیەکی کەمدا، پلاندارێژییەکانی سنۆوبۆڵ بۆ بنیادنانی ئاشەباکە سەریان گرت. زانیاری و وردەکارییە میکانیکییەکان بە زۆری لەو سێ کتێبەوە سەرچاوەیان دەگرت کە هی جۆنس بوون، ئەوانیش: *هەزار شتی بەسوود بۆ خانووەکەت، هەموو مرۆڤێک بەنای*[1] *خۆیەتی، کارەبا بۆ دەستپێکەران.* سنۆوبۆڵ کەپرێکی بۆ خوێندن و لێکۆڵینەوەکانی خۆی تەرخان کردبوو کە پێشتر وەک دەواجین بەکار دەهێنرا. زەوییەکی ساف و لووسی جوانی تەختەییشی هەبوو کە زۆر لەبار بوو تاکوو شتی لەسەر بنووسرێت. چەندان کاتژمێری لەوێ بەسەر دەبرد،

[1] بەنا: وەستای دیوار.

بەردێکی دەخستە مابەینی کتێبەکانی تاکوو پێوە نەدرێن و تەباشیرێکیشی دەنایە نێوان گرێی سمییەوە، جا بێئۆقرانە دەجوولا، چەندان هێڵی بەسەر یەکەوە دەکێشان و پەیتاپەیتا لەتاو خرۆشان و سەرسامیدا مرەیەکی لێوە دەهات. بەرەبەرە هێڵکاری و نەخشەکانی سنۆوبۆڵ بوونە بارستاییەکی کەڵەکەبووی ئاڵۆزی تەوەرە[1] و پێچکەی ددانداوی و زیاد لە نیوەی زەوییەکەیان داپۆشی. ئاژەڵەکانی دیکە سەریان لێ دەرنەدەکرد، بەڵام بەلایانەوە شتێکی سەرسوڕهێن بوو. گشتیان لانیکەم ڕۆژی جارێک دەهاتن تا چاو لە هێڵکارییەکانی سنۆوبۆڵ بکەن. تەنانەت مراوی و مریشکەکانیش دەهاتن و بە پارێزەوە ڕێیان دەکرد، نەبادا پێ بە هێڵێکدا بنێن. لە ناویاندا، تەنیا ناپلیۆن خۆی دوورەپەرێز گرتبوو. هەر لە چرکەساتی یەکەمەوە دژایەتیی خۆی بەرانبەر دروستکردنی ئاشەباکە ڕاگەیاند. لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژێکیان بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو هاتە کەپرەکە، تاکوو پلانەکانی سنۆوبۆڵ بپشکنێت. بە هەنگاوی قورس بەنێو کەپرەکەدا دەسووڕایەوە، لە هەموو وردەکارییەکی نەخشەکە ورد دەبووەوە و جارێک و دووان بەسەریاندا دەیمشاند، دواتر تاوێک هەستایەوە و بە لاچاوێکەوە کەوتە هەڵسەنگاندنیان، کتوپڕ سمی بەرز کردەوە و میزی بە نەخشە و هێڵکارییەکاندا کرد و بێ ئەوەی ورتەی لێوە بێت، شوێنەکەی جێ هێشت.

سەبارەت بە بابەتی دروستکردنی ئاشەباکە، تەواوی مەزراکە بەش‌بەش بووبوو. سنۆوبۆڵ لاریی لەوەدا نەبوو کە

---

[1] Crank: تەوەرە یان مێڵەیەکی چەندلاییە و جووڵە و سووڕانەوە لەناو ماتۆڕی مەکینەدا دروست دەکات.

دروستکردنی ئاشەباکە، کاریکی هەروا سانا نییە. دەبێت بەردی بۆ هەڵبکەندرێت و دیواریان پێ بنرێت، دواتر بایەوان و پەڕەکانی دروست بکرێن و دوای هەموو ئەمانەش، پێویستییان بە دینەمۆ و وایەر دەبێت. سەبارەت بە چۆنییەتیی دەستخستنی ئەم شتانە، سنۆوبۆڵ هیچی نەدەگوت، بەڵام وای دانابوو کە لە ماوەی ساڵێکدا هەر هەمووی تەواو ببێت. بۆ ئاژەڵەکانی ڕوون کردەوە و گوتی کە بەم جۆرە، ڕەنج و ماندووبوونێکی زۆریان لە کۆڵ دەبێتەوە و ئەوکات تەنیا سێ ڕۆژ لە هەفتەیەکدا کار دەکەن. لەولاوە ناپلیۆن هەڵی دەدایێ کە تەنیا پێویستییان بە زیادکردنی ڕێژەی بەرهەمهێنانی خۆراکە، چونکە گەر کاتی خۆیان بە دروستکردنی ئاشەباوە بەفیڕۆ بدەن، ئەوا لە برساندا هەر هەموویان مردار دەبنەوە. ئاژەڵەکان لەژێر درووشمەکانی "دەنگ بدە بە سنۆوبۆڵ و سێ ڕۆژ کار بکە" و "دەنگ بدە بە ناپلیۆن و ئالیکی مفت و چاک دەست بخە" بووبوون بە دوو بەرەوە. بنجامین تاکە ئاژەڵ بوو کە لایەنی هیچکامیانی نەدەگرت، نە بڕوای بەوە هەبوو کە ڕێژەی ئالیکیان زیاد دەکات، نە ئەوەشی کە ئاشەباکە هەندێک ڕۆژی کارکردنی سەختیان لە کۆڵ دەکاتەوە. دەیگوت: «هەرچۆن بێ، ژیان بەردەوامە. خراپتر دەبێ، باشتر نابێ!»

جگە لە بابەتی ئاشەباکە، بەرگریکردن لە مەزراکەش بووبووە جێی باس. ئاژەڵەکان باش دەیانزانی کە هەرچەندە لە شەڕی گەورەکەدا مرۆڤەکانیان بەزاندن، بەڵام بێ گومان دووبارە هێرش دەکەنەوە و سوورتر دەبن لەسەر بەدەستهێنانەوەی مەزراکە و دانانەوەی جۆنس. هەڵبەت گەلێک هۆکاری دیکەش هەبوون کە ئەگەری ڕوودانی شتێکی وایان

زیـاتر پشتڕاسـت دەکـردەوە، چـونکە هەواڵـی بەزانـدنیان بە هەمـوو لادێکـانی دەوروبەردا بـڵاو بووبـووەوە و ئەمەش وای کردبوو مەزرای ئاژەڵان لە تەک مەزراکانی دیکەی هاوسێیدا، زیـاتر چـاو و ئەگەری هێرشـکردنە سـەری لەسـەر بێـت. وەک هەمیشــە، نـاپلیۆن و سـنۆوبۆڵ ڕێـک نەدەکەوتـن. بە بـڕوای نـاپلیۆن، ئاژەڵەکـان دەبـوو چەک هەڵبگرن و لەپێنـاو پاراسـتنی بەرژەوەنـدییەکانی خۆیانـدا، مەشـقی لەسـەر بـکەن. هەرچـی سنۆوبۆڵیش بـوو، دەیگـوت کە پێویسـتە پۆلەکۆتری زیـاتر و زیـاتر بنێـرن، تـاکوو ئـاگری یـاخیبوون لە دڵـی ئـاژەڵانی مەزراکـانی دیـکەدا هەڵبگیرسـێنن. ئەمیـان دەیگـوت کە ئەگەر بەرگری لە خۆیان نەکەن، ئەوا بە دڵنیاییەوە مەزراکەیان داگیر دەکرێـت، ئەوی تریـان دەیگـوت ئەگەر شـەپۆلی یـاخیبوون بە هەموو لایەکدا بڵاو ببێتەوە، ئەوا ئەوکـات هیـچ پێویسـتییان بە بەرگریکـردن نابێـت. ئاژەڵەکـان سـەرەتا گوێیـان بـۆ نـاپلیۆن دەگـرت و دواتـریش سـنۆوبۆڵ، نەیانـدەزانی بـڕوا بە کامیـان بـکەن، بەڵام هەمیشــە لەگەڵ ئەوەیانـدا هـاوڕا بـوون کە لەو کاتەدا قسەی بۆ دەکردن.

دواجار نەخشەکانی سنۆوبۆڵ تەواو بوون. لە کۆبـوونەوەی یەکشەممەی دواتردا، بابەتی ئەوەی دەسـت بکرێ بە بنیادنـانی ئاشــەباکە یـاخود نـا، خـرایە دەنگـدانەوە. کاتێـک لە تەویـلە گەورەکەدا کۆ بوونەوە، سنۆوبۆڵ هەستایەوە و وەک هەمیشە لەلایەن مەڕەکـانەوە قسـەکانی پـێ بـڕدرا، بەڵام هەرچـۆنێکی کردبوو هۆکار و گرنگیی بنیادنانی ئاشەباکەی ڕوون کـردەوە. پاشـان نـاپلیۆن هەسـتایەوە تـاکوو وەڵامـی بـداتەوە. ڕوون و ئاشـکرا گـوتی کە ئەم ئاشـەبایە شـتێکی بێسـەروبەر و قۆڕە و

ئامۆژگاریی هەمووان دەکات کە دەنگی پێ نەدەن، جا دووبارە دانیشتەوە. نزیکەی سێ چرکەیەک قسەی کرد و لەچاو ئەو نیاز و کاریگەرییەی کە دەیویست لەسەر ئاژەڵەکانی دابنێت، قسەکانی زۆر کەمتەرخەمانە هاتنە پێشچاو. لەو کاتەدا سنۆوبۆڵ هەستایەوە و ئەو مەڕانەی دەمکوت کردن کە دووبارە کەوتنەوە باعەباع، جا سەبارەت بە دروستکردنی ئاشەباکە کەوتە وتاردانێکی ناخهەژێنی تکاکارانە. تا ئەو ساتەش، ڕوون بوو کە ئاژەڵەکان بەسەر دوو بەرەدا دابەش بووبوون، بەڵام لە ساتێکدا، سنۆوبۆڵ بەهۆی قسەزانییەکەی خۆیەوە هاوکێشەکەی پێچەوانە کردەوە و دڵی هەمووانی بەدەست هێنا. لەنێو ڕستە بەباقوبریقەکانیدا، وێنای مەزرایەکی ئاژەڵانی دەکرد کە باری گرانی ڕەنج و مەینەت بەسەر پشتی ئاژەڵەکانەوە لابرابوو. ئێستاکە خەیاڵەکانی زۆر لە ئامێری چەوەندەرهاڕین و دەڕاسە دوورتر ڕۆیشتبوون. دەیگوت: «کارەبا، دەکرێ ئامێرەکانی جەنجەڕ[1] و گاسن[2] و کەستەکشکێن[3] و قەنەک[4] و دروێنە و دەزگاکانی باقەکردن بخاتە کار و لە پاڵ ئەمانەشدا گلۆپ و ئاوی گەرم و سارد و

---

[1] جەنجەڕ: چوو، مۆشەن، گام، ئامێری کوتان و جیاکەرەوەی کا و کلۆش لە دان.

[2] گاسن: گاوەسن، ئاسنی نووکتیژ کە لە دەندەی موور ئەخرێ و زەوی پێ دەکێڵن.

[3] کەستەک: کلۆ، کلۆسن، گڵمەت، کلۆگڵ. کۆمای پێکەوەلکاوی گڵی وشکهەڵاتوو.

[4] قەنەک: گرێل، ئامێرێک کە یەک یان چەند گرۆفەرێکی پێوەیە، کە بە تلانەوە بەسەر ڕووبەرێکدا دەچێت و تەختی دەکات و دەیپەستێوێت.

هیتەری کارەبایی بۆ هەموو تەویلەکان فەراهەم بکات.» کە لە قسەکانی بووەوە، هەمووان وەک ڕۆژ لایان ڕۆشن بوو لە دەنگدانەکەدا کێ براوە دەبێ! دروست لەو ساتەدا، ناپلیۆن هەستایەوە و بۆ ساتێک نیگایەکی سەیر و گوماناویی گرتە سنۆوبۆڵ، ئینجا مرخەیەکی وەها سەیر و بەرزی کرد کە ئاژەڵەکان هەرگیز پێشتر گوێیان لێوە نەبووبوو.

لەو کاتەدا حەپەحەپێکی تۆقێنەر لە دەرەوە پەیدا بوو و حەوت سەگی زەبەلاح کە ملەوانەی برۆنزییان لە مل کرابوو، دڕندانە خۆیان بە تەویلەکەدا کرد. یەکڕاست پەلاماری سنۆوبۆڵیان دا و ئەویش هەر ئەوەندەی پێ کرا کە لە شوێنەکەی هەڵبەزێت و خۆی لە کەڵبەی داپلۆسێنەری سەگەکان قوتار بکات. لە چرکەساتێکدا گەیشتە دەرەوەی دەرگەکە و سەگەکانیش بەشوێنییەوە بوون. ئاژەڵەکان لەوە سەرسام و تۆقیوتر بوون کە بتوانن قسە بکەن، پێکڕا لە دەرگەکەدا کۆ بوونەوە تاوەکوو چاویان لە ڕاوەدوونانەکە بێت. سنۆوبۆڵ بە درێژایی ئەو پاوەنەی کە بە ڕاستەڕێکە دەگەیشت غاری دا. بە جۆرێک خێرا و لێبڕاوانە غاری دەدا کە تەنیا بەراز پێی دەکرا، وەلێ سەگەکان هێندەیان نەمابوو پاژنەکانی سمی ڕابگەنەوە. لەپڕ سنۆوبۆڵ هەڵخلیسکا، ئاژەڵەکان لە دڵی خۆیاندا گوتیان تەواو، تازە تیاچوو. وەلێ هەرزوو هەستایەوە و بە هەموو تینوتاوی خۆیەوە و خێراتر لە هەر کاتێکی دیکە تێی تەقاند، سەگەکانیش دووبارە لێی نزیک کەوتنەوە. یەکێکیان خەریکبوو قەپاڵ بە کلکیدا بکات، بەڵام سنۆوبۆڵ خێرا فریای کەوت و بە تەکانێک دەربازی کرد. دواتر گوڕوتینێکی زیاتری دایە بەر خۆی و چەند ئینجێک

دوورتر لە سەگەکان، خۆی بە کونی پەرژینەکەدا کرد و ئیتر نەبینرایەوە.

ئاژەڵەکـان بێـدەنگ و تۆقیـو، گەڕانەوە تەویـلەکە. هێنـدەی نەبـــرد ســـەگەکانیش بە ڕاکەڕاک و حەپەحەپەوە گەڕانەوە تەویلەکە. سەرەتا کەس نەیدەزانی ئەم بوونەوەرانە لە کوێوە سـەریان دەرهێنـا، تـا نـاپلیۆن مەتەڵەکەی بۆ هەڵهێنـان. ئەمانە هەمان ئەو تووتکەسەگانە بوون کە ناپلیۆن لە دایکیانی بڕین و دوور لە هەمـــووان و بە دزیـــیەوە، بەخێـــوی کـــردن. لەگەڵ ئەوەشدا کە بە تەواوی گەورە نەبووبوون، کەچی زۆر کەتە و زەبەلاح دیـــار بـــوون و نیگـــایەکی دڕ و ســـامناکی چەشـــنی گورکیان هەبوو. هەمیشە لە نزیک ناپلیۆنەوە دەمانەوە. سەرنج درا وەک چۆن سەگەکانی دیکە کلکەلەقێیان بۆ بەڕێز جۆنس دەکرد، ئەمانیش بە هەمان شێوە بۆ ناپلیۆنی دەکەن.

هەنووکە ناپلیۆن بە خۆی و سەگەکانی دوایەوە، چووە سەو ئەو ســەکۆیەی کە مەیــجەری پیــر هەمــوو جــار لەســەری دادەنیشت تاکوو وتار بۆ ئاژەڵەکان بدات. ناپلیۆن ڕایگەیاند کە لەوەودا کۆتایی بە کۆبوونەوەکانی بەیانیانی ڕۆژی یەکشـەممە دێت. چـونکە بە قسـەی ئەو، بێمانـا و کـاتکوژن. لە داهـاتوودا، هەمــوو پرســیار و پێشــنیارەکانی تــایبەت بە کاروبارەکــانی مەزرا، بە سەرپەرشــتیی خــۆی و لە کــۆمیتەیەکی تــایبەتی بەرازەکاندا بڕیاریان لەسەر دەدرێت. هەڵبەت هەموو ئەمانە لە کۆبـــوونەوەیەکی داخـــراودا هەڵدەســـەنگێندرێن و دواتـــر بڕیارەکـــانیش لەگەڵ ئاژەڵەکـــانی تـــردا تـــاوتوێ دەکـــرێن. ئاژەڵەکـان هەروەک جـاران، پابەنـد بـوون بە کۆبوونەوەکـانی بەیانیـانییەوە، تـاکوو سـلاوێکی سـەربازیانە لە ئـاڵاکە بـکەن و

سروودی "ئاژەڵانی ئینگلتەرا" بڵێنەوە و فەرمانی کاروبارەکانی ئەو هەفتەیان پێ بدرێت، بەڵام چیدی هیچ وتار و لێدوانێک لەگۆڕێدا نەبوو.

سەرباری ئەو تاسانەی کە ئاژەڵەکان لە وەدەرنانی سنۆوبۆڵەوە تووشی بوون، خراپ لەم ڕاگەیاندن و بڕیارانەی دوایی تۆقیبوون. خۆ ئەگەر هەندێکیان دوو قسەی ماقووڵ و ڕێکوپێکیان بزانیبا، ئەوا بێ گومان لە دژی ناپلیۆن دەیانکردن. تەنانەت بۆکسەریش بیری پەرت بووبوو، بە هەموو توانای خۆیەوە دەیکۆشی بیروڕاکانی دەرببڕێت، بەڵام لە کۆتاییدا هیچ شتێکی بە مێشکدا نەدەهات تاکوو بیڵێت. بێ گومان بەرازەکانیش گشتیان وەک یەک نەبوون و هەندێکیان ڕەوانبێژتر بوون. چوار بێچووەبەراز لە ڕیزەکانی پێشەوەدا وەک دەربڕینی نارەزایەتییەک مرخاندیان و هەر هەموو پێکەوە هەستانەوە و دەستیان کرد بە قسەکردن. بەڵام کتوپڕ سەگەکانی چواردەوری ناپلیۆن حەپەحەپێکی هەڕەشەئامێزانەیان بە ڕوودا کردن، بەرازەکانیش ناچار بێدەنگ و ئاقڵ لە شوێنی خۆیان دانیشتنەوە. ئینجا مەڕەکان بە شێوەیەکی بەردەوام کەوتنە باعاندنی "چوارپێکان خراپن، دووپێکان باشن." چارەکەکاتژمێرێک هەروا بەردەوام بوون و هەموو دەرفەت و ئەگەرێکی گفتوگۆ و مشتومڕیان سەرکوت کرد.

دواتر سکویلەر نێردرایە دەوروبەری مەزراکە، تاکوو ڕوونکردنەوەی پێویست سەبارەت بەم ڕێککەوتن و بڕیارە تازەیە بدات. گوتی: «هەڤاڵان، پێم وایە هەمووتان قەدری ئەو قوربانییە دەزانن کە هەڤاڵ ناپلیۆن دای و بەرپرسیاریەتی و

بارگرانییەکی زیاتری خستە ئەستۆی خۆی. وا نەزانن رکەبەرایەتی شتێکی خۆش بێت هەڤالان! بە پێچەوانەوە، قەرقەشە[1] و بەرپەرسیارییەتییەکی قورسە و دەبێ لە ئەستۆ بگیرێت. بڕوا ناکەم هیچ ئاژەڵێک لەم مەزرایەدا بەقەد هەڤاڵ ناپلیۆن بڕوای بە یەکسانیی ئاژەلان هەبێت. هاوکات زۆر خۆشحاڵ دەبێت کاتێک دەبینێ ئاژەڵەکان خۆیان خاوەنبڕیارن. بەڵام هەڤالان، ئێوەش جاروبار بڕیاری هەڵە و نابەجێ دەدەن، ئێ ئەوکات دەبێ ئێمە قوڕی کوێ بە سەرماندا بکەین؟ وای دانێ خۆت یەکلایی کردووەتەوە تا شوێن قسە قۆڕ و بێماناکانی سنۆوبۆڵ سەبارەت بە ئاشەباکە بکەویت. سنۆوبۆڵێک کە ئێستە دەزانین هیچی لە دژمنێک کەمتر نەبووە!»

ئاژەڵێکیان گوتی: «بەڵام لە شەڕی گەوڕەکەدا زۆر چاونەترسانە جەنگا.»

سکویلەر گوتی: «چاونەترسی بەس نییە هەڤالان، دڵسۆزی و گوێڕایەڵی دوو شتی زۆر گرنگترن. سەبارەت بە شەڕی گەوڕەکەش، دڵنیاتان دەکەمەوە کە خەتای خۆمان بوو زیاد لە پێویست بە شانوباڵی ئەو قەشمەرەماندا هەڵدا و کردمانە شت! ڕێکوپێکی هەڤالان، ڕێکوپێکییەکی توندوتۆڵ! ئەمە هەموو بەرچاوڕوونییەکانی ئەمڕۆ بوون. باش بزانن، ئەگەر بێئاگایانە هەنگاوێکی هەڵە بنێین، دژمنەکانمان یەکسەر هەڵدەکوتنە سەرمان. بێ گومان ئێوەی هەڤاڵ، ناتانەوێ جۆنس بگەڕێتەوە، وا نییە؟»

---

[1] قەرقەشە: گێرە و کێشە.

جارێکی تریش ئەم قسەوباسە بێوەلام مایەوە. گومانی تێدا نەبوو کە ئاژەڵەکان نەیاندەویست چاویان بە سەروسەکوتی جۆنس بکەوێتەوە. خۆ ئەگەر کۆبوونەوەکانی بەیانیانی ڕۆژی یەکشەممەش هۆکارێک بن تاکوو جۆنس بگەڕێتەوە، ئەوا بێ هیچ دوودڵییەک دەبێ بوەستێندرێن. بۆکسەر بە بۆنەی ئەوەوەی کە کاتی زیاتری هەبووە تاکوو سەرلەنوێ بیر لە شتەکان بکاتەوە، هەڕەمەکیانە گوتی: «گەر هەڤاڵ ناپلیۆن گوتبێتی، ئەوا گومانی تێدا نییە کە ڕاستە!» ئیدی لەوەودا، بۆکسەر «ناپلیۆن هەمیشە لەسەر هەقە»ی بۆ درووشمە تایبەتەکەی خۆی کە «زیاتر کار دەکەم» بوو، زیاد کرد.

سەرماوسۆڵەی زستان ڕەویەوە و بەهاری وەرزی کوشتوکاڵ دەستی پێ کرد. ئەو کەپرەی سنۆوبۆڵ هێڵکاریی نەخشەسازییەکەی خۆی تێدا کێشا، داخرا و پێدەچوو هەموو هێڵکارییەکانیشی سڕدرابێتنەوە. هەموو بەیانییەکی ڕۆژانی یەکشەممە، کاتژمێر دە، ئاژەڵەکان لە تەویلە گەورەکەدا کۆ دەبوونەوە تاکوو فەرمانی کاروبارەکانی هەفتەیان پێ بدرێت. کەللەسەری مەیجەری پیر، کە هەنووکە پاک کرابووەوە و هیچ پێستێکی پێوە نەمابوو، لە باخەکە لابرا و لەسەر کۆتەرەدارێکی تەک تفەنگەکە و لە خوار ئالاکەوە دانرا. ئاژەڵەکان پاش مەراسیمی ئالاهەڵکردندا و بەر لەوەی دووپێیان بخەنە تەویلەکەوە، دەبوو بە ڕێز و ئەرزشێکی زۆرەوە بە تەک کەللەسەرەکەی مەیجەردا تێپەڕن. چیدی وەک جاران گشتیان پێکەوە دانەدەنیشتن. ناپلیۆن و سکویلەر و بەرازێکی دیکەش بە ناوی مینیمەسەوە، کە بەرازێکی خواپێداو و بەهرەدار بوو لە نووسینی سروود و شیعردا،

لەسەر سەکۆکە دادەنیشتن و نۆ بەرازی گەنجتریش، ئەڵقەیەکی نیمچەبازنەییان بە دەوریاندا دروست کردبوو و باقیی بەرازەکانی دیکەش لە پشتیانەوە دادەنیشتن. ئاژەڵەکانی دیکەش، لەسەر زەوی ڕووتوقووتی تەویلەکە و لەبەردەم بەرازەکاندا دادەنیشتن. ناپلیۆن فەرمانەکانی بە دەنگێکی زبر و سەربازیانەی بەسام دەخوێندنەوە و دوای ئەوەش کە جارێک سروودی "ئاژەڵانی ئینگلتەرا"یان دەگوتەوە، هەمووان بڵاوەیان لێ دەکرد.

سێ هەفتە پاش وەدەرنانەکەی سنۆوبۆڵ، ئاژەڵەکان واقیان ورما کاتێک بینییان ناپلیۆن سوورە لەسەر دروستکردنی ئاشەباکە. هیچ ڕوونکردنەوەیەکی نەدا کە خێرە وا کتوپڕ بیروڕای گۆڕاوە، بەڵام ڕوون و ئاشکرا پێی گوتن کە ئەم کارە زیادەیە، ڕەنج و ماندووبوونێکی زۆری دەوێ و تەنانەت ڕەنگە پێویستیش بکات ئالیکی ئاژەڵەکانی بۆ کەم بکرێتەوە. بچووکترین وردەکاریی نەخشە و پلاندارێژیی دروستکردنەکەی تەیار کرابوو و کۆمیتەی تایبەتی بەرازەکان بە درێژایی سێ هەفتەی ڕابردوو، کاریان لەسەر کردبوو. چاوەڕوان دەکرا کە دروستکردنی ئاشەباکە و چەند بەرەوپێشچوونێکی جۆراوجۆری دیکە، دوو ساڵ بخایەنن.

ئەو ئێوارەیە سکویلەر بە دزییەوە ئاژەڵەکانی دیکەی تێگەیاندن کە ناپلیۆن هەرگیز دژ بە بنیادنانی ئاشەباکە نەبووە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە، هەر لە سەرەتاوە پێشنیارەکە هی خودی خۆی بوو و ئەو هێڵکاریانەش کە سنۆوبۆڵ بەسەر تەختەی کەپرەکەوە کێشابوونی، هەرهەمووی لەنێوان لاپەڕەکانی ناپلیۆندا دزیبوون، چونکە هەر لە بنەڕەتدا،

بیرۆکەی دروستکردنی ئاشەباکە هی ناپلیۆن بوو. ئاژەڵێک پرسیی: «کەوایە بۆ ئەوەندە دەمارگیرانە لە دژی وەستابووەوە؟» لەو کاتەدا سکویلەر زۆر مەکربازانە گوتی: «ئێ زیری هەڤاڵ ناپلیۆنیش هەر لەمەدا بوو، بە جۆرێ خۆی نیشان دەدا وەک ئەوەی دژی ئاشەباکە بێ، تاکوو دەرفەتێکی گونجاوی بۆ بێتە پێش و سنۆوبۆڵ کە کەسایەتییەکی ترسناک و هاندەرێکی خراپ و بەلارێدابەری ئاژەڵەکان بوو، لە مەزراکە تار بنێت. ئێستە کە سەروسەکوتی سنۆوبۆڵ دیار نەماوە، نەخشەکە دەکرێ رێکوپێکانە کاری لەسەر بکرێت. ئەمە پێی دەوترێت تاکتیک هەڤالان!» چەند جارێک "تاکتیک، بەڵێ هەڤالان تاکتیک!"ی پاتە کردەوە و بەو ناوەدا هەڵدەبەزی و بەدەم پێکەنینەوە کلکەلەقێی دەکرد. ئاژەڵەکان نەیاندەزانی تاکتیک واتە چی، بەڵام سنۆوبۆڵ زۆر بڕوابەخۆبووانە دەدوا و ئەو سێ سەگەش کە لەگەڵی بوون، مڕەیەکی هەڕەشائامێزیان بە ڕووی ئاژەڵەکاندا کرد و ئەوانیش بێ هیچ پرسیار و زۆربڵێییەک کە سەریان بخوات، ڕوونکردنەوەکانی سکویلەریان قبوول کردن.

## بەشی شەشەم

بە درێژایی ئەو ساڵە ئاژەڵەکان وەک کۆیلە کاریان کرد. بەڵام بەم کارکردنەیان دڵخۆش بوون، چونکە دڵنیا بوون کە هەموو دڵۆپە ئارەقە و قوربانییەک کە دەیدەن، لە بەرژەوەندیی خۆیان و نەوەکانی داهاتوویاندایە نەک مرۆڤە بەلاشخۆرە دز و هەرچیوپەرچییەکان.

نزیکەی تەواوی بەهار و هاوین، هەموو هەفتەیەک شەست کاتژمێر کاریان دەکرد و، لەگەڵ پێیان نایە مانگی ئاب، ناپلیۆن رایگەیاند کە ئێوارانی یەکشەممەش پێویستە کار بکەن. هەڵبەت ئەمەیان خۆویستانە بوو، بەڵام هەر ئاژەڵێکیش خۆی لێ بدزیباوە، نیوەی ئالیکەکەیان دەبڕی. لەگەڵ ئەوەشدا، بە پێویستیان دەزانی هەندێک ئیش هەروا بە تەواونەکراوی جێ بهێڵدرێن. بەرهەمی دروێنەی ئەو ساڵەیان، وەک پارساڵ بەپیت نەبوو و کێڵانی ئەو دوو کێڵگەیەش کە دەبوو لە سەرەتای هاویندا بکێڵدرێن و بکرێنە گێزەر، لە کاتی خۆیدا تەواو نەبوو. ئیدی شتێکی چاوەڕوانکراو و ئاشکرا بوو کە ئاژەڵەکان پێشبینیی زستانێکی تووش و سەخت بکەن.

ئاشەباکە زەحمەت و ئاستەنگییەکی زۆری چاوەڕواننەکراوی لە خۆیدا حەشار دابوو. بڕێکی زۆر و زەبەند بەردەقسڵ لە مەزراکەدا هەبوو، بڕێکی باشی لم و

چیمەنتۆش لە ئاودەستەکەی دەرەوەی مەزراکەدا دۆزرابووەوە، بەم جۆرە هەموو کەرەستە و پێداویستییەکانی دروستکردنی ئاشەباکە بەردەست بوون. بەڵام ئەو کێشەیەی کە ئاژەڵەکان لە سەرەتادا گیریان بەدەستەوە خواردبوو، ئەوە بوو کە چۆن بەردەکان بشکێنن و بیانکەن بە پارچەی شیاو و قەبارەگونجاو. بێ لە بەکارهێنانی پیک و نوێڵ هیچ ڕێگەیەکی دیکەیان شک نەدەبرد، ئێ هیچ ئاژەڵێکیش نەیدەتوانی کار بەمانە بکات، چونکە هیچیان نەیاندەتوانی لەسەر پاشووی خۆیان ڕابوەستن. پاش هەوڵ و تەقەلایەکی چەندهەفتەیی، بیرۆکەیەکی دروست بە مێشکی یەکێکیاندا ڕابوورد، ئەویش ئەوە بوو کە سوود لە هێزی کێشکردن ببینن. تاشەبەردەکان، کە تەواوی کانەبەردەکەیان داپۆشیبوو، لەوە گەورەتر بوون کە هەروا ئاسایی سوودیان لێ ببینرێت. ئاژەڵەکان گوریسیان پێوە دەبەستن و دواتر هەموو پێکەوە، مانگا و ئەسپ و مەڕ و هەر ئاژەڵێکی دیکەش کە توانای ڕاکێشانی گوریسی هەبا (تەنانەت بەرازەکانیش لە ساتەوەختە هەستیار و ناهەموارەکاندا) نائومێد و خاووخلیچکانە، بە زەحمەتێکی زۆرەوە بە هەورازی کانەبەردەکەدا سەریان دەخستن، تاکوو لەوێوە بەسەر لێوارە تیژەکاندا بەریان بدەنەوە و بیانشکێنن. بارکردنی بەردە شکاو و پارچەپارچەبووەکان کارێکی ئاسان بوو. ئەسپەکان بە عەرەبانە باریان دەکردن و مەڕەکانیش دانەدانە کێشیان دەکردن، تەنانەت موریڵ و بنجامیشین خۆیان لە کەچە عەرەبانەی دایەنەکە دەبەست و کاری خۆیان ڕادەپەڕاند. ئاخروئۆخری هاوین، وەک پێویست بەرد کۆ

کرابــووەوە و دەیــانتوانی لەژێــر سەرپەرشــتیی بەرازەکانــدا دەست بە دروستکردنی ئاشەباکە بکەن.

ئیشــەکە تەواو هێــواش و تــاقەتپڕوکێن بــوو. هەمــوو جــار ڕۆژێکی ڕەبەقی دەخایاند تاکوو تاشەبەردێک سەربخەنە سـەر ترۆپکی کـانەبەردەکە و هەنـدێک کـاتیش کە بەریـان دەدایەوە، تاشەبەرد بە خۆی نەدەزانی و نەدەشکا.

بەبێ بۆکســەر، بەرد نەدەخـرایە سـەر بەرد و بەقەد هەمـوو ئاژەڵەکان توانای هەبوو. کاتێک تاشـەبەردەکان دەخلیسـکان و ئاژەڵەکـان لە حەژمەتـی ئەوەی پەلکێشــی هەڵـدێرەکە بکـرێن، هاواریـان لـێ هەڵدەسـتا، تەنیـا بۆکســەر بـوو کە لەو کـاتەدا هەموو گوشاری پەتەکەی دەخستە سەر خۆی و دەیوەستاند. کاتێــک هەنگــاو بە هەنگــاو بە هەورازەکەدا ســەردەکەوت، دەکەوتە هەناسـەبڕکێ، سـمەکانی وەک چڕنووک لە زەوییەکە گیــر دەکـردن و لاتەنیشــتە بەرجەســتەکانی شــەلالی ئـارەقە دەبوون و لەو کاتەشدا ڕەزامەندیی هەمووانی بەدەست دەهێنا. جارجـارە کلۆڤەر ئاگاداری دەکردەوە کە هێندە زۆر لە خۆی نەکات، بەڵام بۆکسـەر هەرگیز گوێی بۆ نەدەگرت. وەک بلێیت درووشـمەکانی خـۆی "زیـاتر کـار دەکەم و نـاپلیۆن هەمیشـە لەسـەر هەقە"، چارەسـەری هەمـوو کێشـەکانی بـن. ئێسـتاکە لەگەڵ کەڵەشێرەکە ڕێک کەوتبوو کە دوو چارەک نا، بەڵکوو سێ چارەک زووتر بەئاگای بهێنێت. لە کاتەکـانی حەسـانەوە و دەستبەتاڵیشیدا، کە لەو ڕۆژانەدا هێندە زۆر نەبوون، بە تەنیا و بــێ ئەوەی هــیچ ئاژەڵێــک دەســتبارێکی بــدات، دەچــووە کانەبەردەکە و بارێک بەردی وردکراوی بەرەو لای ئاشـەباکە کێش دەکردە خوارێ.

وێڕای کاری قورس و ڕەنجدانی بێئەندازەی ئەو هاوینە، ئاژەڵەکان حاڵیان زۆر خراپ نەبوو. بەراورد بە سەردەمی جۆنس، ئاژەڵەکان گەر ئالیکی زیاتریان نەبووایە، ئەوا بێ گومان کەمتریان نەبوو. سوود و قازانجی ئەوەی کە تەنیا زگی خۆیان تێر بکەن، نەک چاویان لە هاوکاریکردنی پێنج بنیادەمی چەپەڵ و بەدکار بێت، بە ڕادەیەک بە لایانەوە گرنگ بوو کە ئامادەبوون لەپێناویدا، خۆیان تووشی گەلێک نووشووستی بکەن. هاوکات شێوازی ئاژەڵەکان بەراورد بە هی مرۆڤەکان، لە زۆر کاروباردا کاراتر بوو. بۆ نموونە ڕووتاندنەوەی هەرێزەکە بۆ مرۆڤەکان کارێکی نەکردە بوو. جا مادام ئاژەڵەکان دزییان نەدەکرد، پەرژینکردنی کێڵگەکان و جیاکردنەوەیان لە زەوییە کشتوکاڵییەکان کارێکی زیادە و ناپێویست بوو و ڕانەپەڕاندنی، بارگرانییەکی زۆری پەیوەست بە پەرژین و دەروازەکانی لە کۆڵ ئاژەڵەکان دەکردەوە. بەهەرحاڵ، لەگەڵ کۆتاییهاتنی هاوین، گەلێک کەمتەرخەمی و کێشەی لەبەرچاونەگیرا سەریان دەرهێنا. پێویستییان بە نەوتی سپی، بزمار، پەت، پسکیتی سەگ و ئاسن بوو تاکوو ناڵی ئەسپەکانی پێ دروست بکەن، هاوکات هیچیان لە مەزراکە بەرهەم نەدەهێنران. هەڵبەت دواتر ئیشیان دەکەوتە تۆو و کووت و چەندان ئامێری جۆراجۆر و لە هەمووشی گرنگتر، مەکینەیەک بۆ ئاشەباکە. جا پرسیاری ئەوەی کە چۆن هەموو ئەمانە دروست بکرێن و دەست بخرێن، بە مێشکی هیچ ئاژەڵێکدا نەدەهات.

بەیانییەکی ڕۆژی یەکشەممە، کاتێک ئاژەڵەکان کۆ بوونەوە تاکوو فەرمانیان پێ بدرێت، ناپلیۆن ڕایگەیاند کە لەوەودا

سیاسەتێکی تازە پەیڕەو دەکات. لەمڕۆ بەدواوە، مەزرای ئاژەڵان پەیوەندیی سەودا لەگەڵ مەزراکانی دراوسێدا دەبەستێت. بێ گومان بێ هیچ مەبەستێکی بازرگانی، بەڵکوو تەنیا بۆ دەستخستنی ئەو پێداویستیانەی کە هەنووکە زۆر پێویستییان پێیانە. گوتی: «بابەتی ئاشەباکە، دەبێ لەپێش هەمووشتێکەوە بێ.» بۆ ئەم مەبەستەش ئامادەکاریی پێویستی کردبوو تاکوو بڕێک کا و بەشێک لەو دەغڵودانە بفرۆشێت کە ئەمساڵ دروێنەیان کردبوو. خۆ گەر پێویستیان بە پارەی زیاتریش بێت، ئەوا لەڕێی فرۆشتنی هێلکە بە مارکێتەکانی ویلێنگتەوە، دەتوانن دەستی بخەن. ناپلیۆن گوتی: «دەبێ مریشکەکان دەستودڵ فراوان وەک هەنگاوێک بۆ بنیاتنانی ئاشەباکە، لەم قوربانی و بەخششەیان بڕوانن.»

دووبارە ئاژەڵەکان هەستیان بەو ناڕەحەتییە تەمومژاوییە کرد کە دەوری دابوون. باشە ئەو لێدوانانەی کە هەرگیز سەروکارییان لەگەڵ مرۆڤەکاندا نەبێت، هەرگیز لە بازرگانییەوە تێوە نەگلێن، یاخود سوود لە پارە نەبینن، بەشێک نەبوون لەو مەرجە سەرەتاییانەی کە هەر دوای مەرگی مەیجەری پیر و لە یەکەم کۆبوونەوەی سەرکەوتووی ئاژەڵەکاندا بڕیاریان لەسەر درا؟ ئاژەڵەکان ئەم مەرجانەیان بیر بوون، یان وای بۆ دەچوون کە لە بیریان بێ! ئەو چوار بەرازەی کە پێشتر و ئەو کاتەی ناپلیۆن بڕیاری دا کۆتایی بە کۆبوونەوەکان بهێندرێت نارەزایەتییان دەربڕی، ئەم جارەش بە دەنگێکی شەرمن و ترسنۆکانەوە دووبارە هەڵیان دایێ، بەڵام دەستبەجێ بە حەپەحەپی تۆقێنەری سەگەکان، سەرکوت کران. جا وەک هەمیشە، مەڕەکان کەوتنە باعاندنی "چوارپێکان

خراپن، دووپێکان باشن" و بۆ ساتێک کەشێکی سەیر و نامۆ باڵی بەسەر هەمواندا کێشا. لە کۆتاییدا ناپلیۆن سمی هەڵبڕی تاکوو هەمووان بێدەنگ بن و گوتی کە پێشوەختە هەموو ئامادەکاری کردووە و پێویست ناکا هیچ ئاژەڵێک لەگەڵ مرۆڤدا پەیوەندی ببەستێ، چونکە ئاشکرا دیارە کە چ کارێکی ناجۆر و قێزەونە! تەنیا ئەوەیە کە نیازی وابووە هەموو بارگرانییەکە بخاتە ئەستۆی خۆی. بەڕێز ویمپەر کە پارێزەر بوو و لە ویلینگتۆن دەژیا، قایل بووبوو ببێتە نێوەندگیری نێوان مەزرای ئاژەڵان و مەزراکانی دیکە و هەموو دووشەممانێکیش سەردانی مەزراکە بکات، تاکوو ڕێنمایی پێویست بداتە ئاژەڵەکان. ناپلیۆن وەک هەمیشە بە درووشمی "بژی مەزرای ئاژەڵان!" کۆتایی بە قسەکانی هێنا. پاش وتنەوەی سرروودی "ئاژەڵانی ئینگلتەرا"ش، ئاژەڵەکان هەموو بڵاوەیان لێکرد.

دواتر سکویلەر سووڕێکی مەزراکەی دا، تاکوو هەمووان خاترجەم بکات و گومانەکان لە کەللەیاندا بڕەوێنێتەوە. هەمووانی دڵنیا کردنەوە کە مەرجەکانی تێوەنەگلان لە بازرگانی و سوودبینین لە پارە، نەک تەنیا پشتگوێ نەخراون، بەڵکوو پێشنیاری وەها شتێکیش هەرگیز نەکراوە. ئەم هەموو خەیاڵ و بەدگومانیانە، هەر لە سەرەتاوە لەو درۆ و چەواشەکاریانەوە سەرچاوەیان گرت کە سنۆوبۆڵ دەیبەشینەوە. وەلێ هەندێک ئاژەڵ هێشتا هەر بەدگومان بوون، بەڵام سکویلەر ژیرانە لێی پرسین: «هەڤالان، دڵنیان کە خەونتان نەدیوە؟ هیچ تۆمارێکی ئەم مەرجانەتان لایە؟ لە هیچ شوێنێک نووسراونەتەوە؟» ئاژەڵەکان کە بینییان ڕاست دەکات

و له هیچ شوێنێک نەنووسراونەتەوە، گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە بە هەڵەدا چوون.

هەموو دووشەممەیەک و بەو جۆرەی کە ڕێک کەوتبوون، بەڕێز ویمپەر کە کابرایەکی تەڵەکەبازی خڕەلەی لاجانگدرێژ بوو، سەردانی مەزراکەی دەکرد. لە بوارێکی بچووکی کاروبار و بازرگانیدا پارێزەر بوو، بەڵام بەشی ئەوە بیرتیژ بوو کە بەر لە هەمووان دەرک بەوە بکات کە مەزرای ئاژەڵان پێویستیی بە دەلالێکە و بابەتەکە ئەوە دەهێنێت کە شان بداتە بەر ئەم بەرپرسیاریەتییە. ئاژەڵەکان بە ترس و سەرسامییەکەوە تەماشای هاتن و چوونەکانیان دەکرد و تا بۆیان بکرابا خۆیان لێی بەدوور دەگرت. بەڵام کە ناپلیۆنیان دەدیت لەسەر چوار پێ دەڕوات و فەرمان بەسەر ویمپەری دووپێدا دەدات، هەستێکی شانازییان تێ دەگەڕا و کەمێک بەم ڕێککەوتنە تازەیەیان دڵخۆش دەبوون. پەیوەندیی ئاژەڵەکان لەگەڵ تووخمی مرۆڤدا، وەک پێشتر نەمابووەوە. مرۆڤەکان کە دەیانبینی مەزرای ئاژەڵان بەرەوپێش چووە، هێندەی دیکە ڕق و کینەیان بەرانبەری زیادی دەکرد. هەموو مرۆڤێک لە ناخی دڵییەوە، لەوە ئەرخەیان بوو کە درەنگ یا زوو، مەزرای ئاژەڵان مایەپووچ دەبێت، لە سەرووی هەمووشییەوە، پڕۆژەی ئاشەباکەیان شکست دەهێنێت. لە مەیخانەکاندا یەکیان دەگرت و بە هێڵکاری و بەڵگە بۆ یەکتریان دەسەلماند کە ئاشەباکە دەڕووخێت، یان تەنانەت ئەگەر قیتوقنجیش بوەستێت، ئەوا هەرگیز ناکەوێتە کار. کەچی سەرباری ئەوەش، دژ بە ویستی خۆیان و نابەدلانە، ڕێزیان لە توانا و چالاکیی ئاژەڵەکان دەگرت کە توانیبوویان کاروبارەکانی خۆیان بە ڕێکوپێکی

بەڕێوە ببەن. بۆ نموونە مەزراکەیان بە ناوی ڕاستەقینەی خۆیەوە "مەزرای ئاژەڵان" ناو دەبرد و چیدی وەک پێشتر سەبارەت بەوەی کە هەر مەزرای مەینەرە نەک ئاژەڵان، خۆیان لە گێلی نەدەدا. هاوکات هەموو پەیوەندییەکیان لەگەڵ بەڕێز جۆنسدا پچڕاندبوو و ئەویش هیوابڕاو لە بەدەستهێنانەوەی مەزراکە، سەری خۆی هەڵگرتبوو تاکوو لە سووچێکی دیکەی ویلینگتندا بەردەوامی بە ژیانی بدات. لەگەڵ ئەوەشدا و هێشتا لەڕێی بەڕێز ویمپەرەوە هیچ پەیوەندییەک لەنێوان مەزرای ئاژەڵان و جیهانی دەرەوەدا دروست نەبووبوو، بەڵام دەنگۆ و واتەواتێک هەبوو کە ناپلیۆن تەمای وایە یان لەگەڵ بەڕێز پیلکینگتنی فۆکسوودا ڕێک بکەوێت، یاخود بەڕێز فریدریکی مەزرای پینچفیلد، بەڵام بە هیچ جۆرێک سەنج لەوە نەدرابوو کە نیازی ئەوەی هەبێت هاوکات لەگەڵ هەردووکیاندا ڕێک بکەوێت.

دروست لەم کاتەدا بوو کە بەرازەکان باروبنەیان بۆ خانووی مەزراکە پێچایەوە و ئەوێیان کردە نیشنگەی خۆیان. دووبارە پێدەچوو ئاژەڵەکان یاسایەکیان دژ بەم جووڵانەوەیەی بەرازەکان بیر بکەوتبێتەوە، بەڵام وەک هەمیشە سکویلەر، توانیی قایلیان بکات و تێیان بگەیەنێت بابەتەکە بەو جۆرە نییە کە ئەوان بیری لێ دەکەنەوە. گوتی: «بەرازەکان مێشک و بیرکردنەوەی کۆی مەزراکەن، بێ گومان ئەمە کارێکی پێویست بوو تاکوو شوێنێکی بێدەنگ و کپ بۆ خۆیان دەست بخەن و کارەکانیان تێیدا ڕاپەڕێنن. هاوکات ئەمە زیاتر لەگەڵ شکۆ و پێگەی ڕابەرەکەمان دێتەوە (بەو دواییانە تەنیا لەژێر نازناوی ڕابەردا، باسی ناپلیۆنی

دەکرد) کە لە خانوویێکدا بژی نەوەک تەویلەیەکی پیسوپۆخڵ و بۆگەن.» لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێک لە ئاژەڵەکان نیگەران بوون بە بیستنی ئەوەی کە بەرازەکان نەک تەنیا نان لە مووبەقدا دەخۆن و ژووری میوانەکەشیان کردووەتە ژووری کاتبەسەربردن و کەیف و سەفای خۆیان، بەڵکوو لەسەر تەختەخەویش دەنوون. بۆکسەر وەک هەمیشە، بە درووشمەکەی خۆی "ناپلیۆن هەمیشە لەسەر هەقە!" بابەتەکەی پشتگوێ خست. بەڵام کلۆڤەر، کە باوەڕی وا بوو یاسایەکی تایبەتی دژ بە خەوتن لەسەر تەختەخەوی لە بیرە، چووە کۆتایی تەویلەکە و هەوڵی دا لەو حەوت یاسایە تێبگات، کە بەسەر دیوارەکەوە نووسرابوون، بەڵام بینیی تەنیا توانای خوێندنەوەی پیتەکانی هەیە، هەر بۆیە چوو و موریلی هێنا. گوتی: «موریل، چوارەمین یاسام بۆ بخوێنەرەوە، باسی ئەوە ناکات کە نابێ هەرگیز ئاژەڵ لەسەر تەختەخەو بخەوێت؟»

بە هەزار فەلاکەت، موریل وشە بە وشە حونجەی کرد. تا لە کۆتاییدا بەسەریەکەوە خوێندییەوە: «دەڵێ، نابێ هیچ ئاژەڵێک لەسەر تەختەخەوی چەرچەفدار بخەوێت.»

کلۆڤەر هەرچی دەکرد بیری نەدەهاتەوە کە یاسای چوارەم باسی چەرچەفی تێدا بووە یان نا، بەڵام مادام بەسەر دیوارەکەوە نووسرابوو، کەوایە هەر دەبێ ڕاست بێ. لەو کاتەدا سکویلەر بە خۆی و دوو سێ سەگەوە بەو ناوەدا ڕابوورد و جڵەوی هەموو کێشەکانی خستە ڕکێفی خۆیەوە. گوتی: «هەڤالان، کەوایە ئاگاداری ئەوەن ئێمەی بەراز لەسەر تەختەخەوی خانووەکە دەنووین؟ بۆ نا؟ دەترسم وا بیرتان کردبێتەوە کە یاسایەک هەیە دژی تەختەخەوەکان؟ قابیلە

تەختەخەو چییە، جێگەیەکە بۆ نووستن. تەپۆڵکەیەک کای نێو گەوڕ بۆ خۆی تەختەخەوێکی چاکە! یاسایەکە دژی چەرچەف بوو نەک تەختەخەو، چونکە دروستکراوی مرۆڤە. ئێمە هەرچی چەرچەفێک هەبووە لە خانووی مەزراکە توورمان داوەتە دەرەوە و لە بری ئەوە، پەتۆمان بە خۆماندا داوە. ئەوە ڕاستییە کە ئەم تەختەخەوانە خۆشخەو و ماندوورەوێنن، بەڵام لەچاو ئەو هەموو ماندووبوون و سەرقاڵییەی مێشکمان کە دەبێ لەم ڕۆژانەدا پێی هەستین، دەکرێ بڵێم کە هێشتاکە کەمن بۆ ئێمە! بێ گومان ئێوەی هەڤاڵ ناتانەوێ ئارامیمان لێ هەڵبگرن؟ یاخود هێندە ماندوومان بکەن کە ئەرکەکانی سەرشانمان ڕێکوپێکانە پێ بەڕێوە نەبرێت؟ دڵنیام کە هیچ یەک لە ئێوە نایەوێ دووبارە سەروسەکوتی جۆنس دەر بکەوێتەوە؟»

ئاژەڵەکان سەبارەت بەم خاڵە لارییان نەبوو، سکویلەریان خاترجەم کرد و یەک وشەی تر سەبارەت بە خەوتنی بەرازەکان لەسەر تەختەخەو نەگوترا و بابەتەکە سەر نرایەوە. چەند ڕۆژێک دواتریش کاتێک بڕیار درا بەیانیان بەرازەکان کاتژمێرێک درەنگتر لە ئاژەڵەکانی دیکە بە خەبەر بێن، هیچ ئاژەڵێک نارەزایەتی دەرنەبڕی.

زستان نزیک بووەوە و وێڕای ئەوەی ئاژەڵەکان تەواو ماندوو و بێبڕست بوون، بەڵام هاوکات دڵخۆشیش بوون. ساڵێکی سەختیان بەڕێ کرد و دوای ئەوەش کە بەشێک لە وێنجە و دانەوێڵەکەیان فرۆشتبوو، عەمبار و ئازووقەی خواردەمەنییەکەیان پڕ و دڵخۆشکەر نەبوو، بەڵام ئاشەباکە کەم تا زۆر نیوەی تەواو بووبوو، قەرەبووی هەمووی بۆ

دەکردنەوە. پاش وەرزی دروێنە، کەشوهەوایەکی سامالّ و لەبار پەیدا بوو، ئاژەڵەکان لە هەموو کات سەختتر دەستیان دایە کارکردن و بە دەرفەتیان زانی تاکوو هەموو ڕۆژەکە بەرد کێش بکەن و پێیەکی تر دیوارەکە بەرز بکەنەوە. بۆکسەر ئارامی لە خۆی بڕیبوو، تەنانەت بە شەویش دەهاتە دەرەوە و خۆبەخشانە لەژێر تریفەی مانگدا، کاتژمێرێک و دووان کاری دەکرد. کاتێک ئاژەڵەکان دەستبەتاڵ دەبوون، بە دەوری ئاشەباکەدا دەسووڕانەوە و لە تەماشاکردنی دیوارە تۆکمە و ڕێکەکانی واقیان وڕ دەما، سەریان سووڕ مابوو کە چۆن لەوەوپێش دروستکردنی شتێکی وا بە مێشکیاندا نەهاتبوو. تەنیا بنجامینی پیر هیچ بە ئاشەباکە دڵخۆش نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا و وەک هەمیشە بێ لە قسە پڕووپووچەکانی خۆی کە گوێدرێژەکان تەمەنێکی درێژتر دەژین، هیچی دیکە بە زاریدا نەدەهات.

تشرینی دووەم هات و بای تووشی باشووری خۆرئاوای لەگەڵ خۆیدا هێنا. دەبوو کارکردن بوەستێت، چونکە کەش زۆر لەوە باراناوی و تەڕتر بوو کە ئاژەڵەکان بتوانن چیمەنتۆ بگرنەوە. دواجار ئەو شەوە هات کە ڕەشەبایەکی وا بەهێز کەوت، بیناکانی مەزرای بە جارێک هەژاندن و چەند خشتێکیش بەسەر بانی تەویلە گەورەکەوە کەوتن. مریشکەکان تۆقیو و سەرسام، بە قراسکەقراسک بەئاگا هاتن، چونکە لە خەونیاندا، نالەی فیشەکێکیان لە دوورڕا بیستبوو. بۆ بەیانییەکەی ئاژەڵەکان بەئاگا هاتن و بینییان کە دارئالاکە بەربووەتەوە و دارنارەوەنی بەردەم باخەکەش، وەک توورێکی بچووک، لە ڕەگەوە دەرهاتووە. لەو کاتەدا گریان و هاواری

نائومێدی قـورگی ئاژەڵەکـانی گـرت. چاویـان بە دیمەنێکـی دڵتەزێن کەوت، ئاشەبەکە وێران بووبوو.

پێکـڕا غاریـان دایە شـوێنی ئاشـەباکە. نـاپلیۆن کە پێشـتر بە دەگمەن بۆ پیاسەیەکیش دەهاتە دەر، لەپێش هەموویانەوە ڕای دەکرد. بەڵێ، ئەوەتا بەرهەمی ڕەنج و ئارەقەی نێوچەوانیان بە بـا چـووە، ئەو بەردانەی کە بە هەزار فەلاکەت و دەردیسـەری شـکاندبوویانن و کێشـیان کردبـوونە ئەوێ، هەمـوو لەو نـاوە ورد و خـاش بووبـوون. سـەرەتا ورتەیـان لێـوە نەهـات، وەک پەیکەر، دڵتەنـگ و لێوبەبـار تەماشـای خـۆڵ و خاشـاکی بەردە وربووەکانیـان دەکـرد. نـاپلیۆن بێدەنگانە بەو نـاوەدا دەهـات و دەچـوو و جارجـارە مشـەیەکی دەکـرد. کلکـی ڕەپ کردبـوو، خێراخێرا بەملا و بەولادا دەیجووڵاند و نیشانەی ئەوە بـوو کە بە قووڵی چووەتە نێو بابەتەکەوە و بیر دەکاتەوە. کتوپڕ، وەک ئەوەی گەیشـتبێتە دەرئەنجامێـک، بە دەنگێکـی نـەرم گـوتی: «هەڤـالان، دەزانـن کـێ لەم کـارە بەرپرسـیارە؟ دەزانـن ئەو دژمـنە، ئەو سـەری مـارە کێـیە کە ئاشـەباکەی ئـێمەی ڕمانـد بەسـەر یەکدا؟ سنۆوبۆڵ!» لەپڕ قیڕانـدی: «بەڵـێ ئەمە ئیشـی سنۆوبۆڵە! هەمووشـی لە ڕقانـدا، تـاکوو شکسـت بە پـلانەکەی ئـێمە بهێنێـت و تـۆڵەی وەدەرنـانە ئـابرووبەرانەکەی خـۆی بکـاتەوە، ئەم ناپاکە هیچوپووچە، لەژێـر بـاڵی تـاریکیی شـەودا دزەی کردە ئێرە و کاری ساڵێکی ئێمەی بە با دا. هەڤالان، هەر لێـرە و هەنـووکە، بڕیـاری سـڕینەوەی ئەو ڕسـتە و نازنـاوە دەدەم کە بەخشـرابووە سنۆوبۆڵ "ئـاژەڵی پـاڵەوانی پلەدوو"، هەروەهـا نیـو بوشـڵ سـێو خەلاتـی ئەو ئـاژەڵە دەکەم کە بە

سزای خۆی دەگەیەنێت و دەیتۆپێنێت، بوشلێکی تەواویش بۆ ئەوەی کە بە زیندووی دەیگرێ!»

ئاژەڵەکان بە جۆرێک تاسابوون کە تەنانەت مێشکیان بۆ ئەوەش دەچوو سنۆوبۆل لە وەها کارێکەوە گلابێت. گشتیان لە ڕقاندا هاواریان لێ هەستابوو و کەوتنە بیرکردنەوە لەوەی کە ئەگەر سنۆوبۆل دووبارە پێی خستەوە مەزراکەیان، چۆن پەلبەستی بکەن. هێندەی نەبرد، کەمێک دوور لە تەپۆڵکەکە و بەسەر گیاکەوە، شوێنپێی بەرازێکیان دۆزییەوە. شوێنپێکان تا چەند یاردێکی[1] کەم دەبینران و لەوێ بەدواوە ئاسەواریان دیار نەدەما، بەڵام وا دیاربوو بەرەو کونی پەرژینەکە بچن. ناپلیۆن داخلەدڵانە بەسەریانەوە دەیمشاند و گوتی کە هی سنۆوبۆڵن و هەبێ و نەبێ لە مەزرای فۆکسوودەوە هاتوون.

پاش پشکنینی شوێنپێکان، ناپلیۆن گوتی: «هەڤالان، با لەمە زیاتر نەوەستین. گەلێک کارمان لەپێشە، هەر ئەم بەیانییە دەست دەکەین بە دروستکردنەوەی ئاشەباکە. بە درێژایی زستان، خۆرەتاو بێ یان باران، ئێمە لە کارکردن ناوەستین. با وانەیەکی ئەم ناپاکە بێقیمەتە دادەین و پێی بڵێین کە هەروا ئاسان بۆی ناچێتە سەر تاکوو شکست بە کارەکەمان بهێنێ. بیرتان بێ هەڤالان، نابێ هیچ گۆڕانکارییەک لە پلانەکانماندا بکرێ، بەڵکوو هەروەک جاران تا کۆتایی لە جێبەجێکردنیان بەردەوام دەبین. بۆ پێشەوە هەڤالان! هەر بژی ئاشەباکەمان! بژی مەزرای ئاژەڵان!»

---

[1] Yard: یەکەیەکی پێوانەیە، دەکاتە ٣ پێ.

## بەشی حەوتەم

زستانێکی سەخت بوو. کەشوهەوای تووش و ڕەشەباویی، شـــڵێوە[1] و بەفـــری بە دوادا هـــات و دواتـــریش بـــووە سەهۆڵبەندانێک کە تا کانوونی دووەم نەتوایەوە. ئاژەڵەکان بە هەموو توانای خۆیانەوە کاریان لەسەر بنیادنانەوەی ئاشەباکە دەکرد، دەیانزای کە چاوی جیهانی دەرەوەیان لەسەرە و گەر ئاشەباکە لە کاتی خۆیدا تەواو نەکەن، ئەوا مرۆڤە ناحەزەکان لە خۆشیدا باڵ دەگرن.

مرۆڤەکـــان نەیاندەویســـت بـــڕوا بەوە بـــکەن کە داڕمـــانی ئاشـــەباکە، کـــاری ســـنۆوبۆڵ بێـــت، بەڵکـــوو زۆر بە ســـادەیی دەیانگوت کە دیوارەکانی تەنک بوون، بۆیە داڕماوە. ئاژەڵەکان دەیانزانی کە ئەمە ئەسڵی کێشەکە نییە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاریـان دا کە ئەمجـار لە بری ئەوەی دیـوارەکە هەژدە ئینچ ئەستوو بێت، سێ پێ ئەستوورتر دروستی بکەنەوە و ئەمەش کـۆکردنەوەی بڕێکـی زیـاتری بەردی دەویســت. مـاوەیەکی دوورودرێژ، بەفر یەکپارچە کانەبەردەکەی داپیشبوو و هیچ کارێک نەدەکرا. هەندێ لە ئیشوکارەکان، لە وشکەسەرمایەکی سـەهۆڵبەنداندا ڕاپەڕێنـدران. کـارەکە تـا بڵێی دژوار و سـەخت

[1] تێکەڵەیەک لە بەفر و باران کە پێکەوە دەبارن.

بوو و ئاژەڵەکانیش وەک پێشتر گەشبینانە لێیان نەدەڕوانی و سارد بووبوونەوە. بەردەوام لە سەرمادا وەخت بوو ڕەق ببنەوە و زۆربەی کاتەکانیش زگیان لە برسیەتیدا قوڕەی دەهات. تەنیا بۆکسەر و کلۆڤەر هەرگیز ورەیان بەر نەدا. سکویلەر وتاری باشی هاندەرانەی سەبارەت بە خۆشیی خزمەتکردن و شانازیی ڕەنج و مەینەتکێشان دەدا، بەڵام ئاژەڵەکان زیاتر هاندانیان لە هێزی بۆکسەر و درووشمەکەیدا دەدۆزییەوە کە هەرگیز لە وتنەوەی بێزار نەدەبوو "سەختتر کار دەکەم!"

لە کانوونی دووەمدا، ئازووقەی خۆراک کورتی هێنا. بەشەخۆراکی دانەوێڵەکە خراپ کەمی کردبوو و گوتیان بڕێکی زیادەی پەتاتە فریا دەخەن و قەرەبووی ئەم کورتهێنانەی پێ دەکەنەوە. دواتر دەرکەوت کە بەشی هەرە زۆریی پەتاتەی ژێر عەرزەکەش کە هەڵگیرابوو، سەرما بردوویەتی و زەرد هەڵگەڕاوە، چونکە وەک پێویست بە شتێکی ئەستوور دانەپۆشرابوو. پەتاتەکان زەردباو و نەرم بووبوون و تەنیا بڕێکی کەمیان بە کەڵکی خواردن دەهاتن. ئاژەڵەکان بۆ چەندان ڕۆژێک، بێ لە کلۆش و گاچەوەنەر، هیچ شتێک نەبوو بیخۆن. پێدەچوو برسییەتی تەواو تەنگی پێ هەڵچنیبن.

کارێکی پێویست بوو کە ئەم ڕاستیانە لە جیهانی دەرەوە بشارنەوە. ڕووداوی دارمانی ئاشەباکە بووبووە بیانوویەک و مرۆڤەکان لەسەر ڕەقەم درۆیان لەسەر مەزراکە هەڵدەبەست. دووبارە قسەوباسی ئەوە بڵاو بووەوە کە گوایە ئاژەڵەکان لەتاو نەخۆشی و برسییەتیدا خەریکە بمرن و بەردەوام لەنێو خۆیاندا شەڕ و ئاژاوەیانە و پەنایان بردووەتەوە بەر

هـاوتوخمخۆری و بێچووکووشـتن. نـاپلیۆن بـاش دەیزانـی کە ئەگەر ڕاستیی کورتهێنان و قاتوقڕیی مەزراکە بگات بە جیهانی دەرەوە، ئەوە دەرئەنجـامی باشـی لـێ نـاکەوێتەوە، هەر بـۆیە بڕیـاری دا کەڵـک لە بەڕێـز ویمـپەر وەربگرێـت و دەنگـۆی سـاختەی پـێ بـڵاو بکـاتەوە. تـا ئەم سـاتەش، ئاژەڵەکـان بەرکەوتن و پەیوەندییەکی وایان لەگەڵ سەردانە هەفتەییەکانی بەڕێز ویمپەردا نەبوو، بەڵام هەنووکە چەند ئاژەڵێکی کەمـی دەسـتەبژێرکراو کە زۆربەیـان مەڕ بـوون، ڕێنـوێنی کرابـوون تاکوو هەرەمەکیانە دەنگۆی زیادبوونی بەشـەخۆراکەکەیان بە گـوێی بەڕێـز ویمـپەردا بـدەن. هەر بەم بۆنەیەشـەوە، نـاپلیۆن فەرمانی دا کە سندووقە کەم تا زۆر خاڵییەکانی نێو عەمبار، تا لێوار بە لم پڕ بکەن. دواتریش سـەرەکانیان بە پاشماوەی ئەو دانەوێڵە و خۆراکەی کە مابووەوە، داپۆشیین. هەرچۆنێک بێت، بە بیانوو و پاساوێکی گونجاو بەڕێز ویمپەریـان بـردە عەمبار و ڕێگەیـان دا چاوێـک بە سـندووقەکاندا بخشـێنێت. بەڕێـز ویمـپەر هەڵخەڵەتێنرابـوو، بەڵام بەردەوام هەواڵـی بە جیهـانی دەرەوە دەدا کە هـیچ قـاتوقڕییەک نەکەوتـووەتە مەزرای ئاژەڵان.

بەهەرحاڵ، لە دوابەدواکانی مـانگی کـانوونی دووەمـدا، ڕوون بوو کە پێویستە بڕێک دانەوێڵە لە شـوێنێکی دیکە بخـوازن. لە سـەروبەندی ئەو ڕۆژانەشـدا، نـاپلیۆن بە دەگـمەن دەهـاتە دەرەوە و هەموو کاتەکانی خۆی لە خانووی مەزراکەدا بەسەر دەبرد، کە هەر دەرگایەکی لەلایەن سـەگێکی مڕومـۆچی دڕەوە پـاس کرابـوو. ئەگەر بهاتبـا دەرەوەش، ئەوە بـۆ بـۆنەیەک یـان شتێکی لەو چەشنە بوو و لەلایەن شەش سەگەوە کە دەوریان

دابوو، پاس دەکرا و هەر ئاژەڵێکیش زۆر لێی بهاتبا پێش، ئەوا بە ڕوویـــدا دەوەڕیـــن. بەرەبەرە کـــار گەیشـــتە ئەوەی کە لە زۆربەی بەیانییەکانی ڕۆژانـی یەکشەممەشـدا دەرنەدەکەوت و دووربەدوور لەڕێـــی بەرازێکـــی دیـــکەوە، کە بە زۆری هەر سکویلەر بوو، فەرمانەکانی دەردەکردن.

ســـەرلەبەیانییەکی ڕۆژی یەکشـــەممە، کاتێـک مریشـــکەکان تازەبەتـــازە هـــاتبوونە ژوور تـــاکوو هـــێلکە بـــکەن، ســـکویلەر ڕایگەیاند کە پێویستە هێلکەکانیـان ڕادەست بکەن. ناپلیۆنیش لەڕێی ویمپەرەوە، ڕێک کەوتبوو لەسەر فرۆشتنی چوارسەد هـێلکە لە هەفتەیەکدا. پـارەی ئەم هێلکـانەش دەدرایە ئالیـک و خۆراکی پێویست، بۆ ئەوەی تا کاتی هـاوین و باشـتربوونی بارودۆخەکە، مەزراکە پەکی نەکەوێت.

کاتێک مریشکەکان ئەمەیان بیست، دەنگی ناڕەزایەتییان بەرز کردەوە. پێشتر ئاگادار کرابوونەوە کە ڕەنگە پێویست بکات ئەم قوربـانییە بـدەن، بەڵام هەرگیـز لەو بـاوەڕەدا نەبـوون کە شتێکی وا بە ڕاست بگەڕێت، تازەکی خەریک بوون هێلکەیان دەنایەوە تاکوو هاوین لەسەری کڕ بکەون. مریشکەکان لەسەر ئەوەی کە بردنـــی هێلکەکانیـــان تـــاوانێکە بـــۆ خـــۆی، کەوتـــنە ناڕەزایەتیدەربڕین. بۆ یەکەم جار و پاش ڕاوەدوونانی جۆنس، ئەوەتا شتێک هـاتە ئارا کە شـایەنی ئەوە بێت لەپێناویدا یـاخی ببن. مریشکەکان لەڕێی سێ باڕکی ڕەشی مینۆرکاوە[1]، هەموو

[1] Minorca: جۆرە مریشکێکی ئیسپانییە، لە دورگەیەکدا دەژی بە نـــاوی مینۆرکـــا. دەرکەوتنـــی ئەم هەمـــوو نـــاوە ئیســـپانییە لە ڕۆمانەکەی ئۆروێڵدا، ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ئەو ئەزموونەی کە لە کاتی مانەوەی لە ئیسپانیادا کردوویەتی.

هەولێکی خۆیان دەدا تاکوو ناپلیۆن بە موورادی خۆی نەگات. جا ئەم مریشکانە چی بکەن باشە! هەڵدەفڕینە سەر ستوونە بەرزەکان و لەوێ هێلکەکانیان بەردەدایەوە سەر زەوی تاکوو بشکێن. ناپلیۆن خێرا و بێبەزەییانە کاردانەوەی خۆی نواند. فەرمانی دا بەشەخۆراکی مریشکەکان ببڕن و هەر ئاژەڵێکیش زۆر نا دەنکێک دانەوێڵە بداتە مریشکەکان، ئەوا سزاکەی مەرگ دەبێت. سەگەکان ڕاپەڕاندنی ئەم کارەیان لە ئەستۆ گرت. پێنج ڕۆژ مریشکەکان خۆیان گرت و بەهێز مانەوە، بەڵام دواتر خۆیان بەدەستەوە دا و گەڕانەوە کولانەکانیان و لەو کاتەشدا نۆ مریشک مردار بوونەوە. لاشەکانیان لە باخەکەدا نێژران و گوتیان کە بە نەخۆشیی کۆکسیدیۆسیس[١] مردار بوونەتەوە. ویمپەر لەم بابەتانە بێئاگا بوو و هێلکەکانیش بەپێی خواست و داواکارییەکان دەنێردران، سەوزەفرۆشێک هەفتەی جارێک ئۆتۆمبێلێکی باری دەنارده مەزراکە تاکوو باریان بکات.

بە درێژایی ئەو ماوەیە، سنۆوبۆڵ لە هیچ شوێنێک دەرنەدەکەوت. دەنگۆیەک هەبوو گوایە لە یەکێک لە مەزراکانی دراوسێدا خۆی حەشار داوە، جا یان فۆکسوود بوو یان پینچفیڵد. ئەو ماوەیە ناپلیۆن لەچاو جاراندا، زۆر بەینی لەگەڵ خاوەنمەزراکانی دیکەدا خۆش بوو. دواتر سەرنج درا کۆمەڵێک دار لە گۆڕەپانەکەدا کۆما کراون. ئەم دارانە دە ساڵ لەوەوبەر و پاش بڕینەوەی باخی سوورەچنارەکان، لەوێ

[١] Coccidiosis: نەخۆشییەکە تووشی پەلەوەر دەبێت؛ لەڕێی بەرکەوتنەوە، لە ئاژەڵێکەوە بۆ ئاژەڵێکی دیکە دەگوازرێتەوە و لە قۆناغەکانی دواییشدا، ئاژەڵەکە دەکەوێتە خوێنهێنانەوە.

هەڵچنرابوون. گەرمەی وەرزی دارکڕین بوو و بەڕێز ویمپەر ئامۆژگاریی ناپلیۆنی کرد تاکوو بیانفرۆشێت، لەو کاتەشدا بەڕێز پیلکینگتۆن و فریدریک زۆر دڵیان پێوە بوو بیانکڕن. ناپلیۆن نەیدەزانی بە کێیان بفرۆشێت و نەدەگەیشتە ئەنجام. سەرنج درابوو ئەو کاتانەی نزیک دەبووەوە لەوەی لەگەڵ فریدریکدا ڕێک بکەوێت، دەگوترا کە سنۆوبۆڵ لە فۆکسوود خۆی شاردووەتەوە، کاتێکیش مەیلی بە لای پیلکینگتندا دەچوو، دەگوترا کە سنۆوبۆڵ لە پینچفیلد خۆی شاردووەتەوە.

سەرەتای بەهار بوو، کتوپڕ پەی بە شتێکی ترسناک برا. ئەویش ئەوەبوو کە سنۆوبۆڵ بەردەوام شەوانە سەر لە مەزراکە دەدات! ئاژەڵەکان بە جۆرێک بێزار بووبوون کە لە تەویلەکانیاندا خەو نەدەچووە چاوانیان. هەموو شەو قسەوباس هەبوو کە سنۆوبۆڵ بە دزییەوە و لەژێر باڵی تاریکیدا دزەی کردووەتە نێو مەزراکە و دەستی لە هیچ ئیشێکی قۆڕ و خراپ نەپاراستووە. دانەوێڵەی دزیوە، سەتڵی پڕشیری مانگاکانی قلپ کردووەتەوە، هێلکەکانی شکاندوون، شەتڵەکانی پامال کردوون و توێکڵی دارمیوەکانی گرتووەتەوە. هەرکات شتێکی خراپ و چاوەڕوانینەکراو ڕووی بدابا، ئەوا بێ چەندوچوون دەنرایە مل سنۆوبۆڵ. ئەگەر پەنجەرەیەک بشکێنرابا، یاخود ئاوەڕۆیەک بگیرابا، ئەوا هەر ئاژەڵێک قوت دەبووەوە تاکوو بڵێت شەو سنۆوبۆڵ هاتووە و ئاسمان بدا لە زەوی هەر ئیشی ئەو بووە. کاتێکیش کلیلی عەمبارەکە ون بوو، هەموو مەزراکە باوەڕیان وابوو کە سنۆوبۆڵ هاویشتوویەتییە نێو بیرەکەوە. جا سەیر لەوەدا بوو کە تەنانەت دوای ئەوەی کلیلەکەشیان لەژێر فەردە خۆراکێکدا

دۆزییەوە، دەمارگیرانە هەر سوور بوون لەسەر ئەوەی بیدەنە پاڵ سنۆوبۆڵ. مانگاکان دەیانگوت کە سنۆوبۆڵ شەو هاتووەتە گەوڕەکانیان و لە گەرمەی خەودا دۆشیونی. جرجەکانیش کە ئەو زستانە سەربەکێشە بوون، دەگوترا کە هاوپەیمانی سنۆوبۆڵن.

ناپلیۆن پشتڕاستی کردەوە کە دەبێ لێکۆڵینەوەیەکی ورد سەبارەت بە جموجووڵەکانی سنۆوبۆڵ بکرێت. ڕۆژێکیان بە خۆی و سەگەکانییەوە هاتە دەر و کەوتنە گەڕانێکی ورد بە بیناگەلی مەزراکەدا و ئاژەڵەکانیش وەک ڕێزێک، لە مەودایەکی کەمێک دوورەوە، شوێنی کەوتبوون. هەموو چەند هەنگاوێک دەوەستا و بۆنی بە زەوییەکەوە دەکرد، تاکوو شوێنپێی سنۆوبۆڵ بدۆزێتەوە، وەک خۆی دەیگوت، لەڕێی بۆنکردنەوە دەتوانێت شوێنپێکان بناسێتەوە. بۆنی هەموو سووچ و کونوقوژبنێکی تەویلە، گەوڕ، کۆڵێت و شەتڵەکانی دەکرد و لە هەمووشیاندا شوێنپێی سنۆوبۆڵی دەدۆزییەوە. لمۆزی دەنا بە عەردەکەوە و پڕ بە لووتی چەند جارێک بۆنەکەی هەڵدەمژی و بە دەنگێکی سامناکەوە دەیگوت: «خۆیەتی، سنۆوبۆڵ لێرە بووە! دەتوانم بۆنی بکەم!» لەگەڵ ناوی سنۆوبۆڵی دەهێنا، سەگەکان خوێن دەزایە چاوانیان، شێت و بەلەسە دەبوون و کەڵبەکانی لاتەنیشتی دەمیانیان دەردەخستن.

ئاژەڵەکان تەواو تۆقیبوون. وایان دەزانی سنۆوبۆڵ بوونێکی نادیارە و ئەمان نایبینن، هەوای دەوروبەریانی تەنیوە و داونیەتییە بەر نەشتەری هەموو جۆرە هەڕەشەیەک. سەرلەئێوارە سکویلەر ئاژەڵەکانی کۆ کردنەوە، ئاسەواری پێشهاتێکی ترسناک بە ڕووخسارییەوە بوو و گوتی کە

هەندێک هەواڵی گرنگ هەن پێویست دەکات پێیان ڕا بگەیەنێت. ڕاڕا و دووڵ سـوووکە هەڵبەزینێـک هەڵـدەبەزی و گـوتی: «هەڤاڵان، پەردە لەسەر ترسناکترین شت هەڵماڵرا. سنۆوبۆڵ خۆی فرۆشتووە بە فریدریکی مەزرای پینچفیلد و ئێستە پلان دادەڕێژێ تاکوو هێرشمان بکاتە سەر و مەزراکەمان لەدەست بستێنێ! سنۆوبۆڵ لەم نێوەندەدا و لە دەستپێکی هێرشەکەدا، وەک ڕێنیشاندەر و چاوساغی فریدریک دەستبەکار دەبێ. بەڵام هەواڵی لەمە شوومتریش لەئارادایە هەڤاڵان! هەموومان پێمان وابوو کە یاخیبوونەکەی سنۆوبۆڵ لە بەرزەفڕی و تینویەتیی خۆیەوە بۆ دەسەڵات سەرچاوەی گرتووە، بەڵام مخابن کە بە هەڵەدا چووبووین. دەزانن هۆکاری ڕاستەقینەی چی بووە؟ سنۆوبۆڵ هەر لە سەرەتاوە دەستی لەگەڵ جۆنسدا تێکەڵ کردووە. بە درێژایی ئەو کاتە سیخوڕی نهێنیی جۆنس بووە. هەموو ئەمانەش لەو بەڵگەنامانەدا سەلمێنران کە لەدوای خۆیەوە بەجێی هێشتوون و ئێمەش هەنووکە دۆزیماننەوە. بە ڕای من هەڤاڵان، ئەمە گرێکوێرەی بابەتێکی زۆر گرنگمان بۆ دەکاتەوە. ئەی بە چاوی خۆمان نەمانبینی کە لە شەڕی گەوڕەکەدا چۆن هەوڵی دا (خۆشبەختانە بێ ئەوەی سەرکەتوو بێ) بە دۆڕانمان بدا؟»

ئاژەڵەکان سەریان سوڕ مابوو. ئەمە خراپەکارییەک بوو، کە دووهێندە دارمانی ئاشەباکەی بەسەر سنۆوبۆڵدا ساغ دەکردەوە. بەڵام ئاژەڵەکان تا چەند خولەکێکیش نەیانتوانی بە تەواوی سەر لەم بابەتە دەر بکەن. هەمووان بیریان هاتەوە، یان پێیان وابوو کە بیریان هاتووەتەوە، کە چۆن لە شەڕی گەوڕەکەدا سنۆوبۆڵ لە پێشیانەوە پێشڕەویی دەکرد و هەموو

جارێکیش هانی دەدان و ورەی بەرز دەکردنەوە و تەنانەت بۆ ساتێکیش و پاش ئەوەی گوللەی تفەنگەکەی جۆنس پشتی بریندار کرد، نەوەستا. سەرەتا کەمێک قورس بوو بڕوا بەوە بکەن کە چۆن دەکرێ سنۆوبۆڵ دەستی لەگەڵ جۆنسدا تێکەڵ کردبێت. تەنانەت بۆکسەریش کە تاکوتەرا و بە دەگمەن پرسیارێکی دەبزرکاند، ئەم مەتەڵەی بۆ هەڵنەدەهێنرا! ڕاکشا و سمەکانی خزاندنە ژێر خۆی، جا چاوی نووقاند و بە هەموو توانای خۆیەوە کۆشیی بیرکردنەوەکانی دابڕێژێتەوە و بیانکاتە قسە، گوتی: «بڕوا بەمە ناکەم، سنۆوبۆڵ نەبەردانە لە شەڕی گەورەکەدا جەنگا! ئاخر بەم دوو چاوەی خۆم بینیم. ئەی ئەوە نەبوو کە دەمودەست و دوای شەڕەکە مەدالیای "ئاژەڵی پاڵەوانی پلە یەک"مان پێ بەخشی؟»

«ئێ هەڤاڵ، کەرییەتییەکەی ئێمەش لەمەدا بوو. بەڵام ئەوەتا ئێستە دەزانین (هەمووی لەو بەڵگە نهێنیانەدا نووسراوە کە دۆزیومانەتەوە) کە لە ڕاستیدا ویستوویەتی سەرمان بکات بە قوڕدا!»

بۆکسەر گوتی: «بەڵام بریندار بووبوو، هەموومان بینیمان کە ڕای دەکرد و خوێنی لێ دەچۆڕا.»

سنۆوبۆڵ وەڵامی دایەوە: «ئەوەش بەشێک بوو لە ڕێککەوتنەکە، گوولەکەی جۆنس تەنیا بە پشتیدا تیغی کردبوو. گەر توانای خوێندنەوەیتان هەبووایە، دەمتوانی هەموو ئەمانەتان لەنێو نووسینەکانی خۆیدا نیشان بدەم. ئەرکی سنۆوبۆڵ ئەوە بووە کە لە ساتێکی گونجاودا، ئاماژە بە کشانەوە و ڕاکردن بکات و مەزراکە هەروا بۆ دژمن جێ

بهێڵێ. خۆ هێندەشی نەمابوو سەرکەوتوو بێ، دەکرێ بڵێم ئەگەر ڕابەرە پاڵەوانەکەی خۆمان، هەڤاڵ ناپلیۆن نەبووایەوە، ئەوا زۆر باش بۆی دەچووە سەر. بیرتان نایەت ئەو کاتەی جۆنس و پیاوەکانی هاتنە گۆڕەپانەکە، چۆن سنۆوبۆل تێی تەقاند و هەندێ ئاژەڵیش شوێنی کەوتن؟ ئەی ئەوەشتان بیر نایەتەوە کە دروست لەو ساتەدا و کاتێ ترس و تۆقین دڵی ئاژەڵانی تەنیبوو و لەوە دەچوو بە تەواوی دۆڕابین، هەڤاڵ ناپلیۆن بە درووشمی "بمرێ مرۆڤایەتی" بەرەو پێش چوو و کەڵبەکانی چەقاندنە لاقی جۆنس؟ بە دڵنیاییەوە ئەمەتان لە یادە هەڤاڵان، وانییە؟» سکویلەر ئەم قسانەی کردن و کەوتە هەڵبەز و دابەز لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر.

ئێستە کە سکویلەر دیمەنەکانی لە زەینی ئاژەڵەکاندا بەرجەستە کردبوون، ئاژەڵەکان لەو بڕوایەدا بوون کە بیریان بێت. بە دڵنیاییەوە هیچیان لەبیر نەبێت، ئەوەیان لە بیر بوو کە لە ساتێکی چارەنووسسازدا، سنۆوبۆل هەڵگەڕایەوە و پاشەکشەی کرد. بەڵام بۆکسەر هێشتاش هەر سەری نەدەهێنایە ڕاستە. لە کۆتاییدا گوتی: «بڕوا ناکەم سنۆوبۆل هەر لە سەرەتاوە ناپاک بووبێ! ئەوەی دواتر کردی بابەتێکی ترە، بەڵام بڕوام وایە کە لە شەڕی گەورەکەدا، سنۆوبۆل ڕابەرێکی باش بوو.»

سکویلەر هێواش و بە زمانێکی ڕەق گوتی: «ڕابەرمان هەڤاڵ ناپلیۆن، پشتڕاستی کردووەتەوە کە سنۆوبۆل بێ چەندوچۆن، بەڵێ هەڤاڵ، بێ چەندوچۆن، هەر لە بنەڕەتەوە سیخوڕ و ئەڵقەلەگوێی جۆنس بووە. بەڵێ، هەر لە سەرەتاوە، تەنانەت بەر لەوەش بیر لە یاخیبوون بکرێتەوە.»

بۆکسەر گوتی: «ئەها، ئەوەیان جیایە. گەر هەڤاڵ ناپلیۆن گوتبێتی، ئەوا دەبێ ڕاست بێ.»

سکویلەر گوتی: «ئافەرین، ئەمەم بە دڵە!» بەڵام سەرنج درا کە بە چاوە پرتەپرتکەرەکانییەوە، لەو کاتەدا نیگایەکی دزێو و ناشرینی گرتە بۆکسەر. جا وەرچەرخا تاکوو بڕوات، بەڵام وەستا و سەرنجڕاکێشانە ئەمەشی بۆ قسەکانی زیاد کرد: «ئاژەڵانی ئەم مەزرایە ئاگادار دەکەمەوە کە چاوکراوە بن. چونکە ئەگەری هەیە ئێستەش هەندێ لە سیخوڕەکانی سنۆوبۆڵ، لە نێوماندا خۆیان شاردبێتەوە!»

چوار ڕۆژ دواتر و سەلەئێوارە، ناپلیۆن فەرمانی دا هەموو ئاژەڵەکان لە گۆڕەپانەکەدا کۆ ببنەوە. وەختێک هەموویان کۆ بوونەوە، ناپلیۆن لە خانووی مەزراکە هاتە دەر و دوو مەدالیاکەی بە خۆیەوە کردبوون (بەم دواییانە بەخشیبوونییە خۆی و ئەوانیش مەدالیای "ئاژەڵی پاڵەوانی پلەیەک" و "ئاژەڵی پاڵەوانی پلەدوو" بوون) نۆ سەگی زەبەلاحیش بەم دیو و بەو دیویدا هەڵدەبەزین و بە جۆرێک دەیانمڕاند کە ئاژەڵەکان تووکی لەشیان ڕاست دەبووەوە! گشتیان کزۆڵە و بێدەنگ لە شوێنەکانی خۆیاندا دانیشتبوون و پێدەچوو پەی بەوە بەرن، کە بارودۆخەکە باش نالێ و لەوەیە شتێکی ترسناک و خراپ بقەومێ.

ناپلیۆن مڕومۆچ وەستا و چاوێکی بە ئامادەبوواندا خشاند، جا مرخەیەکی بەرزی کرد. دەمودەست سەگەکان دەرپەڕین و چوار بەرازیان بە گوێ کێش کردە بەرپێی ناپلیۆن کە لەتاو ترس و ئازاردا دەیانلرخاند. گوێی بەرازەکان خوێنیان لێ

دەچۆڕا و سەگەکانیش کە تامی خوێنیان کردبوو، پێدەچوو بۆ چەند ساتێک تەواو هار و بەلەسە بووبن. جا هەر بۆ ئەوەی سەری هەمووان بسووڕمێنن، سیانیان خۆیان بەسەر بۆکسەردا دا. بۆکسەر بینینی کە بەرەو ڕووی دێن، سمی زەبەلاحی هەڵبڕی و هەر بە حەواوە دانەیەکیانی گرت و کوتای بە عەردەکەدا. سەگە قرووسکاندی تاکوو بۆکسەر بەزەیی پێیدا بێتەوە و دووانەکەی دیکەش کلکیان نایە نێوگەڵیان و ڕایان کرد. بۆکسەر تەماشایەکی ناپلیۆنی کرد تا بزانێ داخۆ پێویستە سەگەکە پانوپلیش بکاتەوە و بیکوژێت یاخود بەرەڵای بکات. لەوە دەچوو ناپلیۆن باری ڕووخساری گۆڕیبێت، بە تووڕەییەوە فەرمانی بە بۆکسەر کرد تاکوو سەگەکە بەر بدات. بۆکسەر سمی بەرز کردەوە و سەگەکە بە جەستەیەکی کوتراوەوە، قرووسکەقرووسک خۆی دزییەوە.

هەنووکە هەرا و ژاوەژاو دامرکاوەتەوە. چوار بەرازەکە لەرزۆک و تۆقیو، مۆری تاوان لە نێوچەوانیان دراوە و چاوەڕوانیی سزای خۆیان دەکەن. ناپلیۆن فەرمانی پێ کردن، تاکوو ددان بە تاوانەکانیاندا بنێن. ئەمانە هەمان ئەو چوار بەرازە بوون کە کاتێک ناپلیۆن کۆبوونەوەکانی بەیانیانی هەڵوەشاندنەوە، ناڕەزایەتیان دەربڕی. بەرازەکان یەکسەر ددانیان پێدا نا کە لەدوای دەرکرانی سنۆوبۆڵەوە، بە نهێنی پەیوەندییان لەگەڵیدا هەبووە و بەشدار و هاوکاری بوون لە ڕووخاندنی ئاشەباکەدا و لەگەڵیشیدا ڕێک کەوتوون تاکوو مەزرای ئاژەڵان ڕادەستی بەڕێز فریدریکی پینچفیڵد بکەن. هەروەها گوتیان کە سنۆوبۆڵ نهێنییەکەی لە لا درکاندوون، ئەویش ئەوەیە کە بە درێژایی سالانی ڕابردوو سیخوڕی

جـۆنس بـووە. هەر کە لە دانپێـدانان بـوونەوە، سـەگەکان قورقوڕاگەیانیان هەڵدڕین و ناپلیۆنیش بە دەنگێکی ترسناکەوە داوای کرد ئەگەر هەر ئاژەڵێکی دیکە شتێکی هەیە بۆ وتن، ئەوا با بێتە پێشەوە و ددانی پێدا بنێت.

ئەو سێ مریشکەی کە ڕابەرایەتیی یاخیبوونی هێلکەکانیان دەکرد، هاتنە پێش و ددانیان پێدا نا کە سنۆوبۆڵ هاتووەتە خەونیان و هانی داون تاکوو بێگوێیی فەرمانەکانی ناپلیۆن بکەن. ئەوانیش بە دەردی بەرازەکان بران و سەربڕدران. دواتر قازێک هاتە پێش و ددانی پێدا نا کە سەروەختی دروێنە، شەش گوڵە گەنمەشامیی دزیون و بە شەودا خواردوونی. جا مەڕێک گوتی کە میزی کردووەتە نێو ئەستێلی ئاوی خواردنەوەی ئاژەڵەکان و گوایە لەلایەن سنۆوبۆڵەوە دنە دراوە. دوو مەڕی دیکەش ددانیان نا بە کوشتنی بەرانێکی پیردا، کە شوێنکەوتوویەکی سەرسەختی ناپلیۆن بووە و لە کاتێکدا کە خۆی بەدەست کۆکەوە نالاندوویەتی، هێندە بە دەوری ئاگرەخۆشەیەکدا ڕاوەدوویان ناوە، تا بە لادا هاتووە و مردار بووەتەوە. گشتیان لە هەمان شوێندا بە سزای خۆیان گەیەندران و کوژران. بەم جۆرە چیرۆکی دانپێدانان و سزادان بەردەوام بوو، تا تەپۆڵکەیەک لاشە لەبەردەم سمی ناپلیۆندا کەڵەکە کرا و بۆنی خوێن کە ئاژەڵان لەدوای وەدەرنانی جۆنسەوە پێی ئاشنا نەبوون، هەوای ئەو ناوەی تەنی.

کاتێک سەرلەبەری ئەمانە کۆتاییان هات، ئەو ئاژەڵانەی کە مابوونەوە، جگە لە بەراز و سەگەکان، بە ترس و لەرزەوە ڕۆیشتن و هەر نەیانزانی چۆن شوێنەکەیان جێ هێشت! تەواو خەمین و ئەژنۆشکاو بوون. نەیاندەزانی بە کامیان زیاتر

سەرسام بن، ناپاکیی ئاژەڵەکان و دەستتێکەڵکردنیان لەگەڵ سنۆوبۆڵ، یاخود ئەو ڕەشەکوژی و سزادانە بێبەزەییانەیەی کە بە بەرچاویانەوە ئەنجام درا؟ خۆ پێشتریش بەشی خۆی دیمەنی خوێنڕشتنیان دیتبوو، بەڵام ئێستە کە لەنێو خۆیاندا دەگوزەرا و دەستیان چووبووە خوێنی یەکدی، بۆ ئەوان زۆر ترسناک و دڵتەزێنتر بوو. لەوەتەی جۆنس پێی لە مەزراکە بڕیوە، هیچ ئاژەڵێک ئاژەڵێکی دیکەی نەکوشتووە. تەنانەت جرجێکیش نەکوژراوە، چ جای ئاژەڵی دیکە! هەموویان بەرەو ئەو تەپۆڵکە بچووکەی کە ئاشەبا نیوەناچڵ دروستکراوەکەی بەسەرەوە بوو، ملی ڕێیان گرتە بەر و لەوێ بە مەبەستی ئەوەی گەرمیان بێتەوە، لە نزیک یەکەوە مۆڵین. هەموویان لەوێ بوون، کلۆڤەر، موریل، بنجامین، مانگاکان، مەڕەکان و هەموو پۆلە قاز و مریشکەکان، تەنیا پشیلەکە نەبێت کە کتوپڕ و بەر لەوەی ناپلیۆن داوا لە ئاژەڵەکان بکات تاکوو لە گۆڕەپانەکەدا کۆ ببنەوە، ون بوو. قەیرێک هەروا بێدەنگ مانەوە و کەس ورتەی لێوە نەدەهات. تەنیا بۆکسەر هەستابووەوە، شێتگیر و بێئۆقرانە دەهات و دەچوو و جارجارەش لە سەرسامیاندا ورتەیەکی لێوە دەهات. لە کۆتاییدا هاتە گۆ و گوتی: «من سەر لەمە دەرناکەم. بڕوام نەدەکرد لەم مەزرایەدا شتانێکی لەم جۆرە ڕوو بدەن. هەبێ و نەبێ خەتاکە لە خۆمانە. بە ڕای من چارەسەرەکەش هەر ئەوەیە کە زیاتر کار بکەین. لەمەودوا دەبێ بەیانیان کاتژمێرێک زووتر بەئاگا بێم.»

لەو کاتەدا وازی لە هاتن و چوونە شێتگیرانەکەی خۆی هێنا و ڕێی خۆی بەرەو کانەبەردەکە گرتە بەر. کە گەیشتنە ئەوێ،

دوو بارەبەردی یەک لەدوای یەکی کۆ کردەوە و بەر لەوەی بە تەواوی شەو دابێت، کێشی کردنە لای ئاشەباکە.

ئاژەڵەکان دەمیان بووبووە تەڵەی تەقیو و بێ ئەوەی هیچ بڵێن، لە دەوری کلۆڤەر کۆ بوونەوە. ئەو تەپۆڵکەیەی کە بەسەریەوە مۆڵیبوون، دیمەنی تەواوی گوندەکانی دەوروبەری لە بەردەمدا والا کردبوون. بەشی هەرە زۆری مەزراکەیان لێوە دیاربوو، لەوەڕگا بەرینەکان کە تا سەر ڕاستەڕێکە درێژ بووبوونەوە، کێڵگەی وێنجەکە، باخەکە، ئەستێڵی ئاوخواردنەوەکە، ئەو زەوییە کێڵدراوانەی کە لاسکەگەنمی ئەستووری تازە و سەوز تێیاندا سەریان دەرهێنابوو، بانە سوورەکانی بیناگەلی مەزرا کە لە دووکەڵکێشەکانیانەوە دووکەڵ لوولی دەخوارد و دەهاتە دەرەوە. چ ئێوارەبەهارێکی ساف بووا پرشنگی چینچینی خۆری ئاوابوو، سەوزەگیا و پەرژینە شکاوەکانی ڕووناک کردبوونەوە. هەرگیز مەزرایەکیان نەبووە (لەپڕ بە سەرسامییەکەوە بیریان کەوتەوە کە مەزرای خۆیانە، ئینچ بە ئینچی موڵکی ئەوانە) ئەمەش بۆ ئاژەڵەکان تەواو دڵخۆشکەر و شادیهێن بوو. کلۆڤەر سەیری سەرەولێژایی گردەکەی کرد و چاوانی پڕ بوون لە فرمێسک. خۆ ئەگەر قسەی دڵی بکردبا، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەیگوت کە ئەمە ئەو شتە نەبوو چاوەڕوانییان دەکرد، کاتێک چەند ساڵێک لەمەوبەر خۆیان تەرخان کرد تاکوو جۆنس لە مەرزاکە دەرپەڕێنن. ئەمان ئەو شەوەی کە مەیجەری پیر هانی دان یاخی ببن، بۆ ئەم قەسابخانە و دیمەنی ترس و تۆقینە نەدەگەڕان! خۆ ئەگەر کلۆڤەر پێشتر وێنەیەکی داهاتووی لە مێشکدا بووبا، ئەوا وێنەی کۆمەڵگەیەکی ئاژەڵان دەبوو کە

تێیدا ئاژەڵەکان یەکسانن و ڕزگاریان بووە لە برسییەتی و قامچی خواردن، هەمووان بەپێی توانای خۆیان کار دەکەن و بەهێز لاواز دەپارێزێت، وەک چۆن ئەو لە شەوی وتاردانەکەی مەیجەری پیردا، لەڕێی سمەکانییەوە بێچووەمراوییەکانی پاراستن. لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەزانی هۆکار چییە کە بە ڕۆژگارێک گەیشتوون هیچ ئاژەڵێک ناتوانێ قسەی دڵی خۆی بکات، ڕۆژگارێک کە هەموو کون و کەلەبەرێک سەگێکی دڕی حەپەحەپکەری تێدا قوت بووەتەوە و دەبێت تەماشای هاوەڵانت بکەیت کە پاش ئەوەی ددان بە تاوانە سەرسوڕهێنەرەکانیاندا دەنێن، لەتوپەت دەکرێن. هاوکات هیچ بیرۆکەیەکی یاخیبوون و لادان لە مێشکیدا نەبوو. دەیزانی ئەگەر تەنانەت شتەکانیش هەر بەم جۆرە بگوزەرێن، ئەوا هێشتا هەر لە سەردەمی جۆنس باشترە و، لە سەروو هەمووشییەوە ڕێگریکردن لە گەڕانەوەی مرۆڤەکان پێویستییەک بوو. گرنگ نییە چی دەبێت و چی نابێت، ئەو هەر دڵسۆز و سەرڕاست بە هەموو توانای خۆیەوە کار دەکات و ئەو فەرمانانە جێبەجێ دەکات کە پێی دەدرێن و ڕابەرایەتیی ناپلیۆن پەسەند دەکات. بەڵام خۆ دواجار ڕوونە کە کڵۆڤەر و هەموو ئاژەڵەکانی دیکە، بۆ وەها مەبەستێک نەیانکۆشی. لەپێناو ئەمەدا نەبوو کە سنگیان دایە بەر گوللەی جۆنس و کەوتنە دروستکردنی ئاشەباکە. ئەمانە هەموو بیرکردنەوەی ئەو بوون، بەڵام هەرچییەکی دەکرد نەیدەتوانی بە وشە دەریان ببڕێت.

دواجار لە قەرەبووی هەموو ئەو وشە نەگوتراوانەدا، دەستی کرد بە وتنی سروودی "ئاژەڵانی ئینگلتەرا". ئاژەڵاکانی

دەوروبەریشی بە هەمان شێوە دەستیان پێکرد و سێ جاران لە دڵەوە، بەڵام هێواش و خەمگینانە، بە جۆرێک کە هەرگیز لەوەوپێش وەها نەیانچڕیبوو، وتیانەوە.

کاتێک بۆ سێیەمین جار لە وتنەوەی بوونەوە، سکویلەر بە خۆی و دوو سەگەوە هات و پێدەچوو هەواڵێکی گرنگی پێ بێت تاکوو پێیان ڕابگەیەنێت. جا گوتی بە فەرمانێکی تایبەتیی هەڤاڵ ناپلیۆن، ئاژەڵەکان چیدی نابێ سروودی "ئاژەڵانی ئینگلتەرا" بڵێنەوە.

ئاژەڵەکان لەو کاتەدا دەگەڕانەوە.

موریل گوتی: «بۆچی؟»

سکویلەر بە زمانێکی ڕەق وەڵامی دایەوە: «چونکە چیدی پێویستیمان پێی نییە هەڤاڵ! "ئاژەڵانی ئینگلتەرا" سروودی یاخیبوون بوو، بەڵام وا ئێستە یاخیبوونەکە بە ئەنجام گەیەندراوە و سزادانی ناپاکەکانی ئەم ئێوارەیە کۆتائەرک بوو. دژمن لە ناوەوە و دەرەوە بەزێنراوە. لە سروودی "ئاژەڵانی ئینگلتەرا"دا ئاواتمان دەخواست کە لە داهاتوودا بە کۆمەڵگەیەکی باشتر بگەین، بەڵام ئەوەتا پێی گەیشتین. ئیدی ڕوونە کە ئەم سرووده سوودێکی نەماوە.»

سەرباری ئەوەی ئاژەڵەکان ترسابوون، بەڵام دەکرا هەندێکیان لە دژی ئەم بڕیارە بوەستنەوە، وەلێ لەو کاتەدا مەڕێک کەوتەوە باعاندنی "چوارپێکان خراپن، دووپێکان باشن" و بۆ چەند خولەکێک هەروا بێبڕانەوە بەردەوام بوو و کۆتایی بە گفتوگۆکە هێنا.

بەهەرحـــاڵ چیـــدی ســــروودی "ئـــاژەڵانی ئینگلـــتەرا" نەبیســترایەوە. لەبـری ئەوە، مینیمەســی شــاعیر، ســروودێکی دیکەی دانا کە بەم جۆرە دەستی پێدەکرد:

مەزرای ئاژەڵان، مەزرای ئاژەڵان

لە سایەم هەرگیز پێت ناگا زیان!

ئەم ســروودە هەمــوو ســەرلەبەیانییەکی ڕۆژی یەکشــەممە، پــاش هەڵکردنــی ئــاڵاکە دەگــوترایەوە. بەڵام بە جۆرێــک لە جۆرەکـــان و بە لای ئاژەڵەکـــانەوە، ئـــاواز و وشـــەکانی نەدەگەیشتنە ئاستی ئەوانەی "ئاژەڵانی ئینگلتەرا".

## بەشی هەشتەم

چەند ڕۆژێک دواتر و کاتێک ئەو ترسە کپ بووەوە کە بەهۆی سزادانەکانەوە لەنێو ئاژەڵاندا تەشەنەی کردبوو، هەندێک لە ئاژەڵان بیریان کەوتەوە، یان پێیان وابوو بیریان کەوتووەتەوە کە یاسای شەشەم دەڵێ: «نابێ هیچ ئاژەڵێک، ئاژەڵێکی دیکە بکوژێت.» کەچی لەبەردەم بەراز و سەگەکاندا هیچیان نەیاندەوێرا باسی بکەن، بەڵام بڕوایان وابوو کە کوشتنەکانی ئەو ئێوارەیەوە، لەگەڵ ئەم ڕاسپاردەیەدا نایێنەوە. کلۆڤەر داوای لە بنجامین کرد تاکوو یاسای شەشەمی بۆ بخوێنێتەوە، کاتێکیش بنجامین وەک خووی هەمیشەیی خۆی گوتی کە نایەوێت لەو کێشانەدا خۆی هەڵبقورتێنێ، کلۆڤەر ڕۆیشت و موریلی هێنا. موریل یاسای شەشەمی خوێندەوە و بەم جۆرە بوو: «نابێ هیچ ئاژەڵێک، بەبێ هۆ ئاژەڵێکی دیکە بکوژێت.» بە جۆرێک لە جۆرەکان، دەربڕینی "بەبێ هۆ" لە بیرەوەریی ئاژەڵەکاندا نەمابوو! بەڵام ئێستە تێدەگەیشتن کە یاساکە پێشێل نەکراوە؛ چونکە بە دڵنیاییەوە، هۆکارێکی ماقووڵ لەپشت کوشتنی ئەو ناپاکانەوە هەبووە کە بووبوونە هاوپەیمانی سنۆوبۆڵ.

تەواوی ئەو ساڵە، ئاژەڵەکان سەختتر لە ساڵی پێشوو ڕەنج و زەحمەتیان کێشا. دووبارە دروستکردنەوەی ئاشەباکە و هەڵچنینی دیوارەکان بە ئەستوورییەکی دووهێندەی ئەوانەی

پێشوو و تەواوکردنی لە کاتی خۆیدا و لە لایەکی دیکەشەوە ڕاپەڕاندنی کارە ئاسایی و ڕۆژانەییەکانی مەزراکە، تەواو تاقەتپڕوکێن و بێزارکەر بوون. هەندێک کات ئاژەڵەکان هەستیان دەکرد بەراورد بە سەردەمانی جۆنس، کاتژمێرگەلی زیاتر کار دەکەن و ئالیکەکەشیان لە هی ئەوکات باشتر نییە. بەیانیانی یەکشەممە، سکویلەر پارچە کاغەزێکی باریکەلەی درێژی بە سمی دەگرت و بە دەنگێکی بەرز لیستەی ئەو ژمارانەی بۆ دەخوێندنەوە کە دەیانسەلماند بەرهەمهێنانی هەموو جۆرە کەرەستەیەکی خۆراک بە ڕێژەی لە سەدا سەد، دووسەد، سێسەد، چوارسەد و پێنجسەد و تا کۆتایی... زیادی کردووە. ئاژەڵەکان هیچ هۆکارێکیان نەبوو تاکوو بڕوا بە قسەکانی نەکەن، بە تایبەت کە زۆر باش بیریان نەدەهاتەوە کە پێش یاخیبوون، بار و گوزەرانیان چۆن بووە. هەر هەمان بەزم بوو و هەندێک ڕۆژیش هەستیان دەکرد لە داهاتوودا ماوەی ئیشکردنیان کەم دەبێتەوە و ئالیکەکەشیان زیاد دەکات.

ئێستە هەموو فەرمانەکان لەلایەن سکویلەر، یاخود بەرازێکی دیکەوە دەدران. ناپلیۆن زۆر کەم لە دەرەوە دەبینرا و ئاسایی دوو هەفتە جارێک دەردەکەوت. کاتێکیش دەهاتە دەر، تەنیا سەگەکانی دەستوپێوەندی یاوەرییان نەدەکرد، بەڵکوو کەڵەشێرێکی ڕەشیش لە پێشییەوە مارشی دەکرد و بەر لەوەی ناپلیۆن دەست بە قسەکانی بکات، لەبری زووڕناژەن پڕ بە گەرووی دەیقوقاند "قووووو قووو قووو قوووو". دەگوترا تەنانەت لە خانووی مەزراکەشدا، لە ژوورێکی جیا لەوانی دیکەدا دەمێنێتەوە، بە تەنیا ژەمەخۆراکەکانی دەخوات و دوو سەگیش بە دیارییەوە دەوەستن و پاسی دەکەن و هەمیشەش

لە قاپوقاچاخەکـانی *کـراون دێربـیدا*[1] نـان دەخـوات، کە لە شووشەپێشـخوانێکی ژووری میـوانەکەدا پێشـکەش دەکـران. سـەرباری ئەمـانەش بڕیـار درا لەوەودوا، جـگە لە دوو ساڵیادەکەی دیکە، دەبێت تفەنگەکە لە ساڵڕۆژی لەدایکبوونی ناپلیۆنیشدا بتەقێندرێت.

ناپلیۆن چیدی هەروا وەک ناپلیۆنێکی سادە ناوی نەدەهێنرا، بەڵکوو هەمیشـە بە شـێوازێکی فەرمـی ناویـان دەهێنـا، وەک: «ڕابەرمان، هەڤاڵ ناپلیۆن». وێڕای ئەمەش، بەرازەکان زۆر حەزیان دەکرد نازناوی تازەی بدەنە پاڵ، وەک: باوکی هەموو ئاژەڵان، تۆقێنەری مرۆڤایەتی، پارێزەری تەویلەی مەڕەکان، هـاوڕێی بێچووەمراوییەکـان و تـا کۆتـایی. سـکویلەر لە وتارەکانیدا دەرهەق بە دانایی ناپلیۆن، دڵسافی، خۆشەویستیی قووڵی بەرانبەر هەموو ئاژەڵانی دونیا و بە تایبەت ئەو ئاژەڵە ناشادانەی کە کۆیلە و لەبیرکراو لە مەزرا دوورەدەستەکاندا ژیانیـان دەگوزەرانـد، دەیـدایە پـرمەی گریـان و فرمێسـک بە گۆناکانیدا دەهـاتە خـوار. ئیدی بووبـووە خـوو و نەریتێک کە هەمـوو سـەرکەوتن و بەختێکـی بـاش بـدرێتە پـاڵ نـاپلیۆن. زووزوو لێرە و لەوێ گوێت لە مریشکێک دەبوو کە بە گوێی دانەیەکی دیکەیدا دەچپاند: «لە سایەی سەری هەڤاڵ ناپلیۆنی ڕابەرمانەوە، لە ماوەی شەش ڕۆژدا، پێنج هێلکەم کردووە»،

---

[1] Crown Derby: کۆنترین یاخود دووەم کۆنترین کۆمپانیای قاپ و قاچـاخە، لە شـاری دێربـی ئینگلـتەرا بنیـاد نـراوە. بەرهەمەکانیـان بە کـوالێتیی بەرز و نەخشـونیگاری گرانبەهـا دەناسرێنەوە، کە تەنانەت خێزانە شاهانەییەکانی ئینگلتەراش، خۆراکیان تێدا خواردوون.

یـــاخود دوو مانگـــا، بەدەم تینوویەتیشـــکاندن لە ئـــاوی ئەسـتێڵەکەوە دەیـانگوت: «سـوپاس بـۆ ڕابەرایەتیـی هەڤـاڵ نـاپلیۆن، ئەم ئـاوە چەنـد تـامی خۆشـە!» هەمـوو هەسـت و خوستی مەزراکە، بە شیعرێک دەردەبڕا کە لەلایەن مینیمەسی شاعیرەوە بەم شێوەیە نووسرابوو:

ئەی پشتوپەنای هەتیوان!

ئەی سەرچاوەی بەختەوەری!

ئەی خوداوەندی خۆراکی بەرازەکان!

کە لە چاوی هێمن و فەرماندەرت دەڕوانم،

ڕۆحم گڕ دەگرێت

وەک خۆر لە ناوجەرگەی ئاسماندا،

هەڤاڵ ناپلیۆن!

تۆیت بەخشەری هەر شتێک

کە ئافراوێندراوانت حەزی لێ دەکەن،

ڕۆژی دوو ژەم سکتێر، شوێنخەوی کایینی خاوێن

هەموو ئاژەڵێک، گەورە یا بچووک،

لە تەویلەکەی خۆیدا بە ئارامی دەنوێت،

چونکە تۆ هۆشیارانە ئێشک دەگری

ئەی هەڤاڵ ناپلیۆن

گەر بێچووەبەرازێکی شیرەخۆرەم دەبوو،

بەر لەوەی گەورە ببێت

تەنانەت بەقەد بوتڵێکی نیولیتری یاخود تیرۆکێک،

دەبوو فێر ببێت

سەرڕاست و بڕوادار بەرانبەرت بوەستێت

بەڵێ، دەبوو یەکەم هاواری

هەڤاڵ ناپلیۆن بێت!

ناپلیۆن شیعرەکەی زۆر بەدڵ بوو و داوای کرد لەسەر دیواری تەویلەکە، لە دیوی پێچەوانەی حەوت یاساکەوە، بنووسرێتەوە. وەک چۆن وێنەیەکی ناپلیۆنیش، کە بە بۆیەی سپی لەلایەن سکویلەرەوە کێشرابوو، بەسەریەوە دانرا.

لەو کاتەدا ناپلیۆن لەڕێی ویمپەری بریکارییەوە، چووبووە ڕێکەوتنێکی ئاڵۆزەوە لەگەڵ فریدریک و پیلکینگتندا. کۆمەڵە دارە لەسەر یەک هەڵچنراوەکان هێشتا نەفرۆشرابوون. لەنێو ئەم دووانەشدا، فریدریک زیاتر دڵی چووبووە سەر کڕینیان، بەڵام نرخێکی ماقووڵی بۆ ناپلیۆن پێشنیار نەدەکرد. هاوکات قسەوقسەڵۆک و دەنگۆکانی هێرشکردنە سەر مەزراکە و ڕووخاندنی ئاشەباکە لەلایەن فریدریک و پیاوەکانییەوە کەوتبووەوە سەر زاران، بنیادنانی ئاشەباکە، ئاگری ئیرەیی و کینەی لە دڵی پیاوەکاندا دادەگیرساند. لە لایەکی دیکەشەوە

دەگـوترا کە سـنۆوبۆڵ هێشـتا لە مەزرای پینچفیلـددا خـۆی حەشـار داوە. چلەی هـاوین بـوو، ئاژەڵەکـان ئاگـادار کـرانەوە تاکوو گوێ لەو سێ مریشکە بگرن کە هـاتنە پێش و ددانیـان پێدا نا کە بە هاوکاریی سنۆوبۆڵ ڕێک کەوتوون تاکوو ناپلیۆن بکوژن. هەر لەوێ و بێ سێ و دووکردن سـەریان پەڕێندرا و دەمودەسـت هەمـوو ئامادەکـارییەکی پەیوەسـت بە پاراسـتنی ناپلیۆن، گیرایە بەر. چوار سەگ و هەر یەکێکیان لە سووچێکی تەختەخەوەکەیدا، شـەوانە پاسـی ناپلیۆنیـان دەکرد، وەک چۆن بەرازێکیـان بە نـاوی پینکییەوە ڕاسپارد تـاکوو بەر لە نـاپلیۆن یەک بە یەکـی ئەو خۆراکـانە تـاقی بکـاتەوە کە بـۆی ئامـادە دەکران، نەبادا ژەهراوی کرابن.

هاوکـات هەر ئەو مـاوەیە دەنگـۆی ئەوە هەبـوو کە نـاپلیۆن ڕێک کەوتووە تاکوو دارەکان بە پیلکینگتن بفرۆشێت و وێڕای ئەمەش، بەتەمـا بـوو سـەبارەت بە ئـاڵوگۆڕکردنی چەنـد بەرهەمێکـی تـایبەت لەنێـوان مەزرای ئـاژەڵان و فۆکسـووددا، ڕێککەوتنێکی جددی واژۆ بکـات. پەیوەنـدیی نێوان پیلکینگتن و نـاپلیۆن، هەرچەنـد لەڕێـی ویمپەرەوە ناڕاستەوخۆ گفتوگۆیـان دەکـرد، تـا ڕادەیەک هاوڕێیـانە بـوو. ئاسـایی وەک مرۆڤێـک، ئاژەڵەکـان متمـانەیەن بە پیلکینگـتن نەبـوو، بەڵام بەلایـانەوە لە فریدریک باشتر بوو کە هەردوو لا لێی دەترسـان و ڕقیان لێی بـوو. لەگەڵ کۆتاییهـاتنی هـاوین و تەواوبـوونی ئاشـەباکە، دەنگۆکـان سـەبارەت بە هێرشـیکی ناپاکـانە تـا دەهـات زیادیـان دەکرد. دەگوترا کە فریدریک نیـازی وایە بە بیست چەکدارەوە بـدات بەسـەر مەزراکەدا و پیشـوەختە دەمـی دادوەرەوان و پۆلیسەکانی چەور کردووە تا کە دەستی بەسەر بەڵگەنامەکانی

مەزرای ئاژەڵانـــدا گـــرت، کەس نەڵێـــت کەرت بە چەنـــدە و سەرپشکی بکەن. وەک چۆن چیرۆکی دڵتەزین سەبارەت بە وەحشیگەری و ئەشکەنجە بێبەزەییانەکانی فریدریک بەرانبەر ئاژەڵەکانی لە مەزرای فۆکسوود بڵاو دەبوونەوە. ئەسپێکی تا لێـواری مەرگ قـامچیکێش کـردووە، مانگاکـانی لە برسـاندا کوشتوون! سەگێکی هەروا هاویشتووەتە فرن و کوشتوویەتی و ئێـوارانیش بـۆ سـەرگەرمیی خـۆی، پـارچە گـوێزانێکی بە قولاپی کەڵەشێرەکانەوە بەستووە و بە شەڕی داون. ئاژەڵەکان کاتێک دەیانبیست ئەم هەموو دڵرەقییە بەرانبەر هاوەڵەکانیان نوێنـدراوە، لە تووڕەییـدا خوێنیـان دەکـولا و هەنـدێک کـات پرسیان دەکرد تاکوو ڕێگە بدرێن بچنە دەر و هێرش بکەنە سـەر مەزرای پینچفیڵـد، بـۆ ئەوەی وانەیەک بە مرۆڤەکـان دابـدەن، دەریـان بـکەن و هاوەڵەکانیـان ڕزگـار بـکەن. بەڵام سـکویلەر ئامۆژگـاریی دەکـردن کە هەڵسـوکەوتی هەڵەشـانە نەکەن و متمانەیان بە ستراتیژییەکەی هەڤاڵ ناپلیۆن هەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، ڕق و کینەی ئاژەڵان تا دەهات بەرانبەر بە فریدریک زیادی دەکرد. بەیانییەکی ڕۆژی یەکشـەممە، ناپلیۆن لە تەویلەکەدا دەرکەوت و ڕوونـی کـردەوە کە هەرگیز نیـازی نەبـووە دارەکـان بە فریـدریک بفرۆشـێت، بە قسـەی خـۆی، ڕێککەوتن لەگەڵ سووکوسەلیمێکی وا لە شکۆ و کەرامەتی ئەو دەدات. ئەو پـۆلە کـۆترانەی کە دەنێـردرانە دەرەوە تـاکوو هەواڵەکانی یاخیبوون بڵاو بکەنەوە، لێیان قەدەغە کرا کە پێ بنێنە مەزرای فۆکسوود و داوایان لێ کرا لەبری دروشمی "بمرێ مرۆڤایەتی!"، "بمرێ فریدریک" بڵێنەوە. لە دوابەدواکانی هاویـنـدا، پیلانگێڕییەکـی دیـکەی سـنۆوبۆڵ ئاشـکرا بـوو.

بەروبوومی دانەوێڵەکە پڕ بووبوو لە هەرێز، دواتر دەرکەوت سنۆوبۆڵ لە یەکێک لە سەردان و دزەکردنە شەوانەییەکانیدا، تۆوی هەرێزی تێکەڵ بە تۆوی دانەوێڵەکە کردووە. ئەو نێرەقازەش کە دەستی لەم کارە قێزەونەدا هەبوو، لەبەردەم سکوێلەردا دانی بە تاوانەکەیدا نا و یەکسەر لەڕێی قووتدانی هەنگوورەتاڵەیەکەوە[1]، خۆی کوشت. ئیدی ئاژەڵەکان بۆیان دەرکەوت (وەک چۆن تا ئەم ساتەش زۆربەیان هەر بڕوایان وا بووە) کە سنۆوبۆڵ هەرگیز مەدالیای "ئاژەڵی پاڵەوانی پلەیەک"ی پێ نەبەخشراوە. بەڵکوو سەرلەبەری تەنیا ئەفسانەیەک بووە و پاش کۆتاییهاتنی شەڕی گەورەکە لەلایەن سنۆوبۆڵ خۆیەوە بڵاو کراوەتەوە. سەرباری ئەمەش، تانە و تەشەری ئەوە درابووە پاڵی کە لە شەڕەکەدا ترسنۆکی و نەنگیی نواندووە. وەک هەمیشە هەندێک لە ئاژەڵەکان کاتێک گوێیان بۆ ئەم قسانە ڕادەدێرا، سەیریان لێ دەهات، بەڵام سکوێلەر هەر زوو قایلی دەکردن کە کێشەکە لە یادگەیاندایە و باش بیریان نایەتەوە.

زستان بوو، دوای هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر (کە دەبوو گەنم و دانەوێڵەکەش لە کاتی خۆیدا کۆ بکرێتەوە) ئاشەباکە تەواو بوو. دەبوو مەکینەکەی بخرێتە سەر و بۆ ئەم کارەش ویمپەر خەریکی وتووێژی کڕینەکەی بوو، بەڵام هەیکەلەکەی تەواو بووبوو. وێڕای هەموو ئاستەنگی و نەزانکارییەکی

[1] هەنگوورەتاڵە: بەلەدوون؛ گیائایەمە؛ سێوەخووگانە؛ تووڵەزەڕە؛ گیایەکی ژەهراوییە لە تیرەی باینجان، بە ڕیشووی ئەستوور و قەڵەو و ڕەگاژۆ، گەڵای باریک و کورت، گوڵی گەورەی تاک و قاوەیی دەناسرێتەوە.

ئاژەڵەکان و ئەو ئامێرە سەرەتاییانەی کە بەکاریان دەهێنان و بەختــی ڕەش و ناپاکــایی ســنۆوبۆڵیش لە لایەکــی دیــکەوە، ئاشــەباکە لە کــاتی خۆیــدا تەواو کــرا! هــیلاک و مانــدوو بەڵام ســەربەرز، بە دەوری کــارە دانســقەکەیاندا دەســووڕانەوە و لە چاوی ئەوانــدا زۆر لە هــیکەی یەکەم جــار جــوانتر دروســتیان کردبــووەوە. ئەمە جــگە لەوەی کە دیوارەکــانی دوو هێنــدەی ئەوانەی پێشــوو ئەســتورتر بــوون. ئەم جــارە تەقەمەنیــی لــێ دەرچێت، هــیچ هێزێک ئاشــەباکە ناڕوخێنێت! کــاتێکیش بیریــان دەکردەوە کە چ ڕەنجێکیان کێشاوە، بەســەر چ لاوازییەکدا زاڵ بــوون و هەر ورەیــان بەر نەداوە و گۆڕانکــارییە گەورەکەش کاتێک لە ژیانیاندا ڕوو دەدات کە پانکەکانی ئاشــەباکە دەکەونە سووڕانەوە و دینەمۆکە دەکەوێتە کار، خۆبەخۆ ماندوویەتییان دەرەوییــیەوە و بە دەوری ئاشـــەباکەدا دەکەوتــنە غــاردان و هــاواری ســـەرکەوتنیان لێــوە بەرز دەبــووەوە. نــاپلیۆنیش، بە خــۆی و ســەگەکان و کەڵەشــێرەکەیەوە، هــات تــا چاوێــک لە ئاشـــەبا تەواوبــووەکە بکــات، جــا بە تــایبەت پیرۆزبــایی ســـەرکەوتنی لە ئاژەڵەکــان کــرد و بڕیــاری دا ئاشــەباکە نــاو بنرێت، ئاشەبای ناپلیۆن.

دوو ڕۆژ دواتر ئاژەڵەکان بۆ کۆبوونەوەیەکی تایبەت، بانگ کــرانە تەویــلەکە. کاتێــک نــاپلیۆن ڕایگەیانــد کە دارەکــانی فرۆشــتوون بە فریــدریک، گشــتیان بە جارێــک واقیــان ورمــا. سبەی عەرەبانەکانی فریدریک دەگەن تاکوو دارەکان بار بکەن. نـــاپلیۆن بە درێژایـــی ئەو مـــاوەیە و ئەو نزیکبـــوونەوە و دۆســـتایەتییە ڕواڵەتیــیەی کە لەگەڵ پیلکینگتنــدا هەیبــوو، لە ژێرەوە لەگەڵ فریدریکدا بابەتەکەی بڕاندبووەوە.

هیچ پەیوەندییەکیان بە مەزرای فۆکسوودەوە نەما و چەندان نامەی سووکایەتیئامێزیش بۆ پیلکینگتن نێردران. جا داوا لە کۆترەکان کرا کە چیدی سەرشاخی مەزرای پینچفیلد نەگرن و درووشمەکانیان لە "بمریٚ فریدریک"ـەوە بگۆڕن بە "بمریٚ پیلکینگتن". هاوکات ناپلیۆن دڵنیایی دایە ئاژەڵەکان کە دەنگۆکانی هێرشکردنە سەر مەزرای ئاژەڵان لەلایەن فریدریکەوە تەواو ناڕاست بوونە و چیرۆکی دڵڕەقییەکانیشی بەرانبەر ئاژەڵەکان، تەنیا گەورە کرابوون و مێشێکیان لێ کردبوونە گا! بێ گومان دانە بە دانەی ئەم دەنگۆیانەش، لەلایەن سنۆوبۆڵ و سیخوڕەکانییەوە بڵاو کرابوونەوە. ئاخیری دەرکەوت کە سنۆوبۆڵ لە پینچفیلد خۆی نەشاردووەتەوە. لە ڕاستیدا هەرگیز پێی نەخستبووە ئەویٚ، بەڵکوو وەک دەگوترا، ژیانێکی خۆشگوزەرانانەی لە فۆکسووددا دەگوزەراند و لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردووشدا، لای پیلکینگتن خانەنشین بووە.

بەرازەکان سەریان لە زیرەکی و فێڵبازیی ناپلیۆن سوڕمابوو. لەڕێی نزیکبوونەوە و هاوڕێیەتیکردنی پیلکینگتنەوە، وای لە فریدریک کرد کە نرخەکەی بۆ دوانزە پاوەند بەرز بکاتەوە. سکویلەر دەیگوت: «بەڵام بلیمەتی هەڤاڵ ناپلیۆن لەوەدا بوو کە متمانەی بە کەس نەدەکرد، تەنانەت فریدریکیش. فریدریک دەیویست لەڕێی شتێکەوە کە پێی دەڵێن چێک و وا دیاربوو بەڵێننامەیەکی بەسەرەوە نووسرابێت، پارەی دارەکان بدات. بەڵام ناپلیۆن زۆر لەوە زیرەکتر بوو کە تەفرە بدرێت. لەبری ئەوە داوای کرد نەخت لەڕێی پارەی کاغەزیی پێنج پاوەندییەوە و پێش بارکردنیان، پارەکە بدرێت.

فریدریک پێشوەختە پارەکەی دا و ئەم برە پارەیەش بەس بوو بۆ ئەوەی مەکینەی ئاشەباکەی پێ بکڕن.

لەو ماوەیەدا، دارەکان خێرا گواسترانەوە. کاتێک هەمووی تەواو بوو، لە تەویلەکەدا کۆبوونەوەیەک بۆ ئاژەڵەکان ساز درا تاکوو چاو لە پارەکانی فریدریک بکەن. ناپلیۆن شاد و سەربەرزانە دەخەنی، هەردوو مەدالیاکەی بە خۆیەوە کردبوون و لەسەر تەپکەکای سەر سەکۆکە گیرسایەوە، کاغەزە پارەکانیش لە تەنیشتییەوە و لەسەر قاپێکی چینیی موبەقی خانووی مەزراکەدا، جوانجوان لەسەر یەک دانرابوون. ئاژەڵەکان بە ڕیز بە لایاندا ڕادەبووردن و یەک بە یەک تەماشایان دەکردن. بۆکسەر لمۆزی بردە پێش تاکوو بۆنی پارەکان بکات و لەگەڵ هەناسەدانەکانیدا، کاغەزە سپییەکان جووڵانەوە و کەوتنە خشەخش.

سێ ڕۆژ دواتر بوو بە هەلا و دەنگەدەنگ. ویمپەر وەک بەهێ زەرد هەڵگەڕابوو، بەسەر پاسکیلەکەیەوە وەک با بە ڕاستەڕێکەدا دەیئاژوشت، خێرا دابەزییە گۆڕەپانەکە و لەویشەوە بە هەڵەداوان خۆی کرد بە خانووەکەدا. هێندەی نەبرد، نەعرەتەیەکی خنکاوی تووڕانە لە ئەپارتمانەکەی ناپلیۆنەوە بەرز بووەوە. دەنگوباس و هەواڵی ئەو کارەساتەی کە قەومابوو، هەروەک برووسکە بەنێو ئاژەڵەکاندا بڵاو بووەوە. پارە کاغەزییەکان ساختە دەرچوون! فریدریک هەروا بەلاش و حەلاش دارەکانی بۆ خۆی بردن!

دەستبەجێ ناپلیۆن ئاژەڵەکانی کۆ کردنەوە و بڕیاری مەرگی بەسەر فریدریکدا سەپاند. گوتی هەرکات کەوتە ژێر چنگیان،

ئەوا دەبێت بە زیندوویی بکوڵێنرێت. هاوکات ئاژەڵەکانی ئاگادار کردنەوە کە پاش ئەم ناپاکاییە ڕوونە، دەبێت چاوەڕوانیی بەڵای خراپتر بکرێت. لە هەر ئانوساتێکدا بێت، ئەگەری هەیە کە فریدریک و پیاوەکانی ئەو هێرشە بکەن کە لەمێژە چاوەڕوانییان لێ دەکرێت. پاسەوان و ئێشکگر لە هەموو خاڵێکی هاتنەژوورەوەی مەزراکەدا دانران. دواتر و بە مەبەستی ئەوەی کە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ پیلکینگتندا گەرموگوڕ بکەنەوە، نامەیەکی ئاشتەوایییانە بە چوار کۆتردا نێدرایە مەزرای فۆکسوود.

بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر هێرشەکە کرا. ئاژەڵەکان سەرقاڵی خواردنی نانی بەیانی بوون کاتێک ئێشکگرەکان پەلەپەل هاتن و ڕایانگەیاند کە فریدریک و شوێنکەوتووانی، بە دەروازە پێنجشیشییەکەدا هاتوونەتە ژوور. ئاژەڵەکان یەکسەر غاریان دایە ئەوێندەر تاکوو ڕووبەڕوویان ببنەوە، بەڵام ئەم جارە هەروا ئاسان و وەک شەڕی گەوڕەکە، نەیانتوانی سەرکەوتن بەدەست بهێنن. پیاوەکان پانزە دانە بوون و دەرزەنێک تفەنگیان پێ بوون، هەر کە پەنجا یاردێکیش نزیک بوونەوە، کەوتنە دەستڕێژی گوللە. ئاژەڵەکان لەبەرانبەر تەقینەوە و گوللەی چزێنەردا خۆیان پێ ڕانەدەگیرا و وێڕای هەوڵ و تەقەڵای بێهوودەی بۆکسەر و ناپلیۆن، هێندەی نەبرد کشانەوە دوا و هەندێکیان پێشوەختە بریندار بووبوون. ئاژەڵەکان لەنێو بیناگەلی مەزراکەدا خۆیان داڵدە دا و لە مابەینی درز و کەلەبەرەکاندا، بە وریاییەکی زۆرەوە سەرەتاتکێیان دەکرد. تەواوی تەویلەی بەرازەکان و ئاشەباکەش، هەنووکە لەدەستی دژمندا بوو. بۆ ساتێک تەنانەت ناپلیۆنیش هیوابڕاو دیاربوو،

کلکی ڕەپ کردبوو و خێراخێرا ڕایدەتەکاند، هەروا دەهات و دەچوو و نقەی لە خۆی بڕیبوو. نیگای لێوبەبار و خەمگینانەی ئاراستەی مەزرای فۆکسوود دەکرا، ئەگەر پیڵکینگتن و پیاوەکانی زوو بهاتبان بە دەمیانەوە، ئەوە ئەگەری هەبوو ڕۆژەکە بە سەرکەوتنی ئەمان کۆتایی بێت. بەڵام لەو ساتەدا چوار کۆترەکە کە ڕۆژێک لەوەوپێش نێردرابوون، گەڕانەوە. دانەیەکیان لەتە کاغەزێکی پێ بوو کە لەلایەن پیڵکینگتنەوە نێردرابوو و لەسەری نووسرابوو: «دە بخۆن ئەوە دەردتان بێ!»

لەو کاتەدا فریدریک و پیاوەکانی لە نزیک ئاشەباکەدا وەستان. ئاژەڵەکان تەماشایان دەکردن و مرەهاواری تۆقینیان لێوە بەرز بووەوە. دوو پیاویان نوێڵ و چەکوشێکی ئاسنگەریی گەورەیان پێ بوو، کە بە دڵنیاییەوە دەیانویست ئاشەباکەی پێ بڕوخێنن.

ناپلیۆن گوتی: «مەحاڵە! ئێمە دیوارەکانمان زۆر لەوە ئەستوورتر هەڵچنین. تا هەفتەیەکی دیکەش خەریک بن ناتوانن بیڕوخێنن. ورەتان بەرز بێ هەڤاڵان!»

بەڵام بنجامین زۆر ورد سەرنجی جووڵەی پیاوەکانی دەدا. دوو پیاوەکە، بە نوێڵ و چەکوشەکە خەریکی دروستکردنی کونێک بوون لە نزیک بناغەی ئاشەباکەدا. بنجامین هێواش و وەک ئەوەی چێژ لە دیمەنەکە ببینێت، قەپۆزی درێژی لەقاند. جا گوتی: «هەر دەمزانی، نابینن ئەمانە خەریکی چین؟ کەمێکی دی تەقەمەنی لە کونەکە دەئاخنن.»

ئاژەڵەکان تۆقیوانە چاوەڕوانییان دەکرد. ئێستاکە مەحاڵ بوو سەرکێشی بکەن و لە پەناگەی بیناگەلی مەزراکە بێنە دەرەوە. پاش چەند خولەکێکی کەم، پیاوەکان بڵاوەیان لێ کرد و هەر یەکەیان بە لایەکدا تێی تەقاند. جا زرمەیەکی کەڕکەر لەو ناوە بەرز بووەوە. کۆترەکان لە شەقەی باڵیان دا و فڕینە ئاسمان، ئاژەڵەکانیش ناپلیۆنی لێ دەرچێ، هەموویان لەسەر زگ ڕاکشان و دەموچاویان شاردەوە. کاتێک هەستانەوە، دووکەڵێکی خەستی ڕەش لەو شوێنەی کە ئاشەباکەیان لێ بنیاد نابوو، بەرز بووەوە. شنەبا هێواش‌هێواش چڕەدووکەڵی ڕەواندەوە. ئاشەباکەیان بردبوو بە ئاسماندا و ئاسەواری نەمابوو!

ئاژەڵەکان کە ئەمەیان بینی، غیرەت گرتینی. هەموو ئەو ترس و لەرزەی کە چەند ساتێک لەوەوپێش هەستیان پێدەکرد، لەنێو دەریای ڕق و تووڕەییاندا بەرانبەر ئەم کارە دزێو و چەپەڵانایە، نووقم بوو. هاوارێکی دلێرانەی تۆڵەسەندنەوە بەرز بووەوە، بێ ئەوەی چاوەڕوانیی فەرمان بکەن، چوارناڵ بەرەو دژمن غاریان دا. ئەم جارە باکیان بە دەستڕێژی ئەو فیشەکانە نەبوو کە وەک تەرزە بەسەریاندا دەبارین و شەڕەکە بووبووە شەڕێکی دڕندانە و خوێناوی! پیاوەکان بەردەوام یەک لەدوای یەک دەستڕێژیان دەکرد و کاتێکیش ئاژەڵەکان نزیک کەوتنەوە، بووە شەڕێکی دەستەویەخە و پیاوەکان بە تێلاکانی دەستیان و پووتە قورسەکانیان بەربوونە گیانی ئاژەڵەکان. مانگایەک و سێ مەڕ و دووقاز بوونە قوربانی و بە نزیکەی هیچ ئاژەڵێک لەو ناوە بە ساغی دەرنەچووبوو. تەنانەت ناپلیۆن کە لە دواوە ئۆپراسیۆنەکانی ئاراستە دەکردن،

فیشـەکێک سـەری کلکی قرتانـدبوو. بەڵام پیاوەکـانیش هەروا ئاسـان قوتاریـان نەبـوو. سـەری سـێ پیاویـان بە جـووتەی بۆکســەر شــکابوو، دانەیەکیـان زگـی بە شــاخی مانگـایەک هەڵـدرابوو و یەکێکی تریشـیان پـانتۆڵەکەی لەلایەن جیسـی و بلوبێلەوە هەلاهەلا کرابوو. کاتێکیش ئەو نۆ سەگەی ناپلیۆن کە پاسـەوانی تـایبەتی خـۆی بـوون و پێشـتر ڕێنمـایی کردبـوون تــاکوو بە دزیــیەوە بەژێــر پەرژیــنەکەدا بــڕۆن، لەبەردەم پیاوەکاندا ڕاست بوونەوە، کەوتنە وەڕینێکی ترسـناک و تـرس سـەراپای پیاوەکـانی داگـرت. کاتێـک بینییـان دەوریـان بە مەترسی تەنراوە، فریدریک هـاواری لە پیاوەکانی کـرد کە تـا دەرفەت هەیە و بـارودۆخەکە هێنـدەی دیـکە شـلۆق نەبـووە، ڕابـکەن. سـاتێک دواتـر، دژمـن لەپێنـاو پاراسـتنی ژیانیـدا، ترسـنۆکانە ڕای کـرد. ئاژەڵەکـان تـا خـوارووی کـێڵگەکە ڕاوەدوویـان نـان و کـاتێکیش بەسـەر پەرژیـنە دڕکـاوییەکەدا هەوڵـی خـۆ دەربازکردنیـان دەدا، دوایـین جـووتە و قـۆچی خۆیانیان تێ سرەواندن.

ئاژەڵەکان بە هەر نرخێک بێت سـەرکەوتن، بەڵام مانـدوو و بریندار بوون. شەلەشـەل ڕێی خۆیان بەرەو مەزراکە گرتەوە بەر. دیمەنــی لاشــەگەلی بێگیــانی هەڤاڵەکانیـان کە بەســەر گیاکەوە درێژ بووبوون، هەندێکیانی خستە سەر قوڵپی گریـان. تاوێـک بێـدەنگ و مــات، بە غەم و پەژارەیەکـی زۆرەوە لەو شوێنەی کە ڕۆژانێک ئاشەباکە تێیدا قیتوقۆز بەرز بووبووەوە، ڕاوەســـتان. بەڵـــێ، فەوتــــا! نـــزیکەی تەواوی ڕەنـــج و مانـدووبوونەکەیان بە بـا چـوو. تەنـانەت بناغەکەشی نەمـابوو! خۆ ئەگەر ئەم جارە بیانەوێت دووبارە دروستی بکەنەوە، ئەوا

ناتوانن وەک جاری پێشوو، سوود لە بەردە وردبووەکان وەرگرن. ئەم جارە بەردەکانیش نەمان، هێز و پەستانی تەقینەوەکە سەدان یارد دوور توورڕی دابوون. هەر دەتگوت ئەو ناوە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئاشەبای لێ نەبووە.

هەر کە گەیشتنەوە مەزراکە، سکویلەر کە بە درێژایی شەڕەکە دەتگوت زەوی قوتی داوە، بە قونەقون بەرەو ڕوویان هات، کلکەسووتێی دەکرد و زەردەی شادییەک بەسەر لێوانییەوە بوو. دواتر ئاژەڵەکان بە ئاراستەی بیناکەلی مەزراکە، ناڵەی تەقینی تفەنگیان بەر گوێ کەوت.

بۆکسەر گوتی: «ئەم تەقەکردنە بۆچی؟»

سکویلەر گوتی: «بۆ ئاهەنگگێڕان بەبۆنەی سەرکەوتنەکەمانەوە!»

بۆکسەر لە کاتێکدا کە ئەژنۆکانی خوێنیان لێ دەتکا، ناڵێکی لەدەست دابوو و سمێکیشی قڵیشابوو و دەرزەنێک فیشەکیش بەر لاقەکانی کەوتبوون گوتی: «کامە سەرکەوتن؟!»

«هەڤاڵ، یانی چی کامە سەرکەوتن؟ ئەی مەگەر دژمنمان لەسەر خاکەکەمان، خاکی پیرۆزی مەزرای ئاژەڵان تارنەنا؟»

«بەڵام ئەوان ئاسەواری ئەو ئاشەبایەیان سڕییەوە کە ئێمە دوو ساڵ بێوچان کارمان تێدا کرد»

«جا ئەوە کەی کێشەیە؟ دانەیەکی دیکە دروست دەکەینەوە. گەر بمانەوێ، نەک یەک دانە، شەش دانەش دروست دەکەین. هەڤاڵ، تۆ نرخی ئەو کارە مەزنە نازانیت کە پێی هەستاین. دژمن پێی خستبووە سەر ئەم خاکەی کە ئێستە من و تۆی

بەسـەرەوەین. بەڵام ئەوەتـا ئێسـتە، لە سـایەی سـەری ڕابەر ناپلیۆنەوە، ئینج بە ئینجیمان بەدەست هێنایەوە!»

جـا بۆکسـەر گـوتی: «کەواتە ئـێمە ئەو خاکەمـان بەدەسـت هێنایەوە کە پێشتر هی خۆمان بوو!»

سـکویلەریش گـوتی: «ئـێ بەڵـێ، ئەمە سـەرکەوتنەکەی ئێمەیە!»

ئاژەڵەکـان چـوونە گۆڕەپـانەکە. ئەو گـوللانەی کە بەر لاقـی بۆکسـەر کەوتبـوون و چووبـوونە ژێـر پێسـتەکەی، ئـازارێکی بەسـوێیان هەبـوو. هەر لە ئێسـتاوە بیـری لەو هەمـوو مانـدووبوون و کـارە قورسـەی دروسـتکردنەوەی ئاشـەباکە دەکـردەوە کە دەبـوو بەرد بە بەرد هەر لە سـەرەتاوە دەسـتی پێ بکەنەوە و لە بیری خۆیشیدا خۆی بۆ ڕاپەراندی ئەم ئەرکە تەیـار دەکرد. بەڵام بۆ یەکەم جـار، بیـری کـردەوە کە ئێسـتە تەمەنـی یـانزە سـاڵە و ڕەنگە ئەو گـوڕوتین و هێـزەی جـارانی نەمابێت.

بەڵام کاتێـک ئاژەڵەکـان ئاڵاکەیـان بە شـەکاوەیی بینـی و دووبـارە گوێیـان لە تەقەی تفەنـگ (کە حەوت جـار بەسـەر یەکەوە تەقێنـدرا) و وتـارەکەی نـاپلیۆن بـوو کە دەرهەق بە نەبەزی و کۆڵنەدانیـان پیرۆزبـایی لـێ کردن، هەسـتیان دەکرد سەرکەوتنێکی مەزنیان تۆمار کردووە. قوربانیـانی شـەڕەکە لە پرسـەیەکی شـیاودا نێـژران، بۆکسـەر و کلـۆڤەریش عەرەبانەکەیـان وەک تەرمکێش ڕادەکێشـا و نـاپلیۆنیش لەپێش هەموویـانەوە پیشـڕەویی دەکـرد. دوو ڕۆژی ڕەبەق بـۆ شـاییگێڕان تەرخـان کـرا. گـۆرانی دەگـوترا، وتـار دەدرا و

دەستڕێژی زیاتر بە ئاسماندا دەکرا، وەک چۆن خەڵاتی تایبەتیش دەبەخشرا، کە ئەویش پێدانی سێویێک بوو بە هەموو ئاژەڵەکان، دوو ئۆنسە[1] دانەوێڵە بە باڵندەکان و سێ پسکیتیش بە سەگەکان. دواتر ڕایانگەیاند کە شەڕەکە ناو دەنرێت شەڕی ئاشەباکە و ناپلیۆنیش مەدالیای تازەی بە ناوی مەدالیای *بەیداخە سەوزەکە* دروست کردبوو، دواتریش بەخشییە خۆی. لەم کەیف و شادییەشدا ئاژەڵەکان بابەتی بەدبەختیی پارە ساختەکانیان بیر چووەوە.

چەند ڕۆژێک دواتر بەرازەکان لە ژێرزەمینی خانووەکەدا بەسەر سندووقێک ویسکیدا کەوتن. ئەم سندووقە هەر لە شوێنی خۆی بووە، بەڵام لەو کاتەوەی هاتبوونە ناو خانووەکە، هیچیان سەرنجیان نەدابوو. ئەو شەوە دەنگی گۆرانیوتنێکی بەرز لە خانووی مەزراکەوە دەهات و ئاژەڵەکان سەریان سوڕما کاتێک بینییان ئاوازی "ئاژەڵانی ئینگلتەرا" تێکەڵ بە ژاوەژاوەکە بووە. دەوروبەری کاتژمێر نۆ و نیو، ناپلیۆنیان بینی کە بە خۆی و کڵاوێکی *بۆولەری*[2] کۆنی بەڕێز جۆنسەوە، زووزوو لە دەرگەی پشتەوە دەهاتە دەر و تاوێک بە دەوری گۆڕەپانەکە غاری دەدا و دووبارە خۆی بە خانووەکەدا دەکردەوە. بەڵام بۆ بەیانییەکەی، بێدەنگییەکی ڕەها باڵی بەسەر خانووی مەزراکەدا کێشا. هیچ بەرازێک دیار نەبوو. نزیکەی کاتژمێر نۆ سکویلەر دەرکەوت، خاووخلیچکانە و دارەدار ڕێی دەکرد، چاوەکانی خێل بووبوون و کلکی

---

[1] Ounce: یەکەیەکی پێوانەیە و زیاتر لە بەریتانیان بەکار هێنراوە، یەک ئۆنس دەکاتە نزیکی ٢٨.٣ گگ

[2] Bowler: کڵاوێکی لەگانیی قەراغ هەڵگەڕاوەی ساف و لووسە.

تەپیوی بە پشتیدا شۆڕ بووبووەوە و لە هەر ڕوویەکەوە سەیرت بکردبا، دەتگوت خراپ نەخۆش کەوتووە. سکویلەر ئاژەڵەکانی کۆ کردنەوە و گوتی هەواڵێکی دڵتەزێن و کارەساتبار هەیە کە پێویست دەکات پێیان ڕا بگەیەنێت. ئەویش ئەوە بوو کە هەڤاڵ ناپلیۆن لە گیانەڵادا بووە!

دەنگی هەنسک و گریان بەرز بووەوە. کا لەبەردەم دەرگاکەلی خانووی مەزراکەدا ڕۆکرا و ئاژەڵەکان بە پێدزە ڕێیان دەکرد. فرمێسک لە چاوانیان قەتیس دەما و لە یەکیان دەپرسی کە ئەگەر ڕابەرەکەیان بمرێت، ئەوا دەبێ چیان بەسەر بێت! دواتر دەنگۆی ئەوە بڵاو بووەوە کە سنۆوبۆڵ ڕێگەیەکی دۆزیوەتەوە تاکوو خۆراکەکەی ناپلیۆن ژەهراویی بکات. کاتژمێر یانزە، دووبارە سکۆیلەر هاتە دەر تاکوو لێدوانێکی دیکە بدات. گوتیان کە وەک دواهەمین ئەرکی سەرشانی خۆی، هەڤاڵ ناپلیۆن بڕیارێکی دەرکردووە: هەر ئاژەڵێک خواردنەوەی کهولی بخواتەوە، ئەوا بە مەرگ سزا دەدرێت.

دەمەوئێوارە دەرکەوت ناپلیۆن حالی باشتر بووە و بۆ بەیانیی ڕۆژی دواتریش، سکویلەر بە ئاژەڵەکانی ڕاگەیاند کە هەڤاڵ ناپلیۆن خەریکە بە تەواوی تەندروستیی ئاسایی دەبێتەوە. دواتر و هەر سەرلەئێوارەی هەمان ڕۆژ، ناپلیۆن گەڕایەوە سەر کارەکانی و دەگوترا کە داوای لە ویمپەر کردووە لە ویلینگتن هەندێک ناملیکەی سەبارەت بە پاڵاوتن و ترشاندنی میوە بۆ پەیدا بکات. هەفتەیەک دواتر ناپلیۆن فەرمانی کێڵانی ئەو پاوەنی پشت ڕەزەی دا کە وا بڕیار بوو بکرێتە شوێنی لەوەڕان و حەسانەوەی ئاژەڵە

خانەنشینبووەکان. گوتیان زەوییەکە کەڵکی نەماوە و پێویستە دووبارە تۆوی تیا بچێنرێتەوە، بەڵام هەر زوو دەرکەوت کە ناپلیۆن نیازیەتی بیکاتە جۆ.

لەم کاتەدا ڕووداوێکی وا سەیر هاتە پێش کە هیچ ئاژەڵێک سەری لێ دەرنەدەکرد. دەوری کاتژمێر دوانزەی شەو، زرمەیەکی بەرزی شکانی شتێک لە گۆڕەپانەکە بەرز بووەوە و ئاژەڵەکان بە پەلەپڕووزێ لە گەوڕەکانیان هاتنە دەرەوە. ئەو شەوە، مانگەشەو بوو. لەبەردەم کۆتایی دیواری تەویلەکە و دروست لەو جێیەی کە حەوت یاساکە بەسەر دیوارەکەوە نووسرابوون، پەیژەیەکی شکاوی دووکەرت بوو دۆزرایەوە. سکویلەر وڕ و کاس لە تەک پەیژەکەوە درێژ بووبوو و لە نزیک دەستیشییەوە چرایەک و فڵچەیەک و قوتووێک بۆیەی ڕژاو دەبیندرا. سەگەکان خێرا ئەڵقەیەکیان بە دەوری سکویلەردا بەست و هەر ئەوەندەی کەوتەوە سەر پێی و هێزی ڕێکردنی تێ گەڕایەوە، تا بەر دەرگای خانووەکە پاسیان کرد. ئاژەڵەکان تەقەی سەریان دەهات و هیچیان نەیاندەزانی کە ئەمە چی دەگەیەنێت، تەنیا بنجامینی پیر وەک ئەوەی تەواوی بابەتەکە بزانێت و نەیەوێت یەک وشەش بدرکێنێت، قەپۆزی لەقاند.

چەند ڕۆژێک دواتر و کاتێک موریێل یاساکەی لە بەرخۆیەوە دەخوێندەوە، بۆی دەرکەوت ئاژەڵەکان یاسایەکی دیکەشیان بە هەڵە لە بەر کردووە. وایان دەزانی یاسای پێنجەم بەم جۆرەیە: «نابێ هیچ ئاژەڵێک خواردنەوەی کهوولی بخواتەوەز»، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەبوو کە دوو وشەیان بیر

تەپیوی بە پشتیدا شۆڕ بووبووەوە و لە هەر ڕوویەکەوە سەیرت بکردبا، دەتگوت خراپ نەخۆش کەوتووە. سکویلەر ئاژەڵەکانی کۆ کردنەوە و گوتی هەواڵێکی دڵتەزێن و کارەساتبار هەیە کە پێویست دەکات پێیان ڕا بگەیەنێت. ئەویش ئەوە بوو کە هەڤاڵ ناپلیۆن لە گیانەڵادا بووە!

دەنگی هەنسک و گریان بەرز بووەوە. کا لەبەردەم دەرگاگەلی خانووی مەزراکەدا ڕۆکرا و ئاژەڵەکان بە پێدزە ڕێیان دەکرد. فرمێسک لە چاوانیان قەتیس دەما و لە یەکیان دەپرسی کە ئەگەر ڕابەرەکەیان بمرێت، ئەوا دەبێ چیان بەسەر بێت! دواتر دەنگۆی ئەوە بلاو بووەوە کە سنۆوبۆڵ ڕێگەیەکی دۆزیوەتەوە تاکوو خۆراکەکەی ناپلیۆن ژەهراویی بکات. کاتژمێر یانزە، دووبارە سکۆیلەر هاتە دەر تاکوو لێدوانێکی دیکە بدات. گوتیان کە وەک دواهەمین ئەرکی سەرشانی خۆی، هەڤاڵ ناپلیۆن بڕیارێکی دەرکردووە: هەر ئاژەڵێک خواردنەوەی کهولی بخواتەوە، ئەوا بە مەرگ سزا دەدرێت.

دەمەوئێوارە دەرکەوت ناپلیۆن حاڵی باشتر بووە و بۆ بەیانیی ڕۆژی دواتریش، سکویلەر بە ئاژەڵەکانی ڕاگەیاند کە هەڤاڵ ناپلیۆن خەریکە بە تەواوی تەندروستیی ئاسایی دەبێتەوە. دواتر و هەر سەرلەئێوارەی هەمان ڕۆژ، ناپلیۆن گەڕایەوە سەر کارەکانی و دەگوترا کە داوای لە ویمپەر کردووە لە ویلینگتن هەندێک نامیلکەی سەبارەت بە پالاوتن و ترشاندنی میوە بۆ پەیدا بکات. هەفتەیەک دواتر ناپلیۆن فەرمانی کێڵانی ئەو پاوەنی پشت ڕەزەی دا کە وا بڕیار بوو بکرێتە شوێنی لەوەڕان و حەسانەوەی ئاژەڵە

خانەنشینبووەکان. گوتیان زەوییەکە کەڵکی نەماوە و پێویستە دووبارە تۆوی تیا بچێنرێتەوە، بەڵام هەر زوو دەرکەوت کە ناپلیۆن نیازیەتی بیکاتە جۆ.

لەم کاتەدا ڕووداوێکی وا سەیر هاتە پێش کە هیچ ئاژەڵێک سەری لێ دەرنەدەکرد. دەوری کاتژمێر دوانزەی شەو، زرمەیەکی بەرزی شکانی شتێک لە گۆڕەپانەکە بەرز بووەوە و ئاژەڵەکان بە پەلەپرووزێ لە گەورەکانیان هاتنە دەرەوە. ئەو شەوە، مانگەشەو بوو. لەبەردەم کۆتایی دیواری تەویلەکە و دروست لەو جێیەی کە حەوت یاساکە بەسەر دیوارەکەوە نووسرابوون، پەیژەیەکی شکاوی دووکەرت بوو دۆزرایەوە. سکویلەر وڕ و کاس لە تەک پەیژەکەوە درێژ بووبوو و لە نزیک دەستیشییەوە چرایەک و فلچەیەک و قوتووێک بۆیەی ڕژاو دەبیندرا. سەگەکان خێرا ئەڵقەیەکیان بە دەوری سکویلەردا بەست و هەر ئەوەندەی کەوتەوە سەر پێی و هێزی ڕێکردنی تێ گەڕایەوە، تا بەر دەرگای خانووەکە پاسیان کرد. ئاژەڵەکان تەقەی سەریان دەهات و هیچیان نەیاندەزانی کە ئەمە چی دەگەیەنێت، تەنیا بنجامینی پیر وەک ئەوەی تەواوی بابەتەکە بزانێت و نەیەوێت یەک وشەش بدرکێنێت، قەپۆزی لەقاند.

چەند ڕۆژێک دواتر و کاتێک مورێل یاساکەی لە بەرخۆیەوە دەخوێندەوە، بۆی دەرکەوت ئاژەڵەکان یاسایەکی دیکەشیان بە هەڵە لە بەر کردووە. وایان دەزانی یاسای پێنجەم بەم جۆرەیە: «نابێ هیچ ئاژەڵێک خواردنەوەی کهوولی بخواتەوەز»، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەبوو کە دوو وشەیان بیر

چووبـوونەوە و ئەسـڵی یاسـاکە بەم جـۆرە بـوو: «نـابێ هـیچ ئاژەڵێک زیاد لە پێویست خواردنەوەی کهوولی بخواتەوە.»

## بەشی نۆیەم

قڵیشانی سمی بۆکسەر، کاتێکی زۆری دەخایاند تا چاک ببێتەوە. هەر ڕۆژێک پاش ئاهەنگگێڕانی سەرکەوتنەکەیان، دەستیان بە بنیادنانی ئاشەباکە کردبووەوە. بۆکسەر تەنانەت بۆ ڕۆژێکیش دەستی لە کار هەڵنەدەگرت و بە شەرم و نەنگیی دەزانی کە ئاژەڵەکانی دیکە ببینن ئازار دەچێژێت. ئێواران بە نهێنی بە کلۆڤەری دەگوت تەواو بەدەست سمییەوە هەراسانە و ئاستەنگییەکی گەورەی بۆ دروست کردووە. کلۆڤەر لاسکی گژوگیای سرووشتیی دەجووی و وەک مەڵهەم سمی بۆکسەری پێ تیمار دەکرد و بەردەوامیش لەگەڵ بنجامیندا ئاگاداریان دەکردەوە کە ئیدی واز بهێنێت و هێندە خۆی هیلاک نەکات. پێی دەگوت: «سییەکانی ئەسپ تاهەتایە هەروا نامێننەوە!» بەڵام بۆکسەر قسە بە مێشکیدا نەدەچوو، دەیگوت تاکە ئاواتی ئەوەیە پێش پەککەوتن و خانەنشینبوونی، ئاشەباکە ببینێت کار دەکات.

سەرەتا کاتێک بۆ یەکەمین جار یاساکانی مەزرای ئاژەڵان دانران، تەمەنی خانەنشینبوونی ئەسپ و بەرازەکان بە دوانزەساڵی، مانگاکان چواردە، سەگەکان نۆ، مەڕەکان حەوت و مریشک و قازەکانیش بە پێنج دیاری کرا. وەک چۆن لەسەر مووچەی خانەنشینییەکەش ڕێک کەوتبوون. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستە، هیچ ئاژەڵێک لەسەر ئەم مووچەیە

خانەنشین نەکرابوو، بەڵام بەو دواییانە بابەتەکە زیاتر و زیاتر قسەی لەسەر دەکرا. ئێستە کە پاوەنی پشت ڕەزەکە دانرابوو بکرێت بە جۆ، دەنگۆیەک هەبوو کە بەشێکی لەوەڕگە بەرینەکە پەرژین بکرێت و بکرێتە شوێنی حەسانەوە و لەوەڕینی ئاژەڵە خانەنشینبووەکان. سەبارەت بە مووچەی خانەنشینبوونی ئەسپەکان، دەگوترا کە هەموو ڕۆژ پێنج پاوەند دانەوێڵە دەبێت و ڕۆژانی زستان پانزە پاوەند و لانی کەم گیزەر یان سێوێکیش لە پشووە گشتییەکاندا. جا ساڵڕۆژی لەدایکبوونی بۆکسەر، دەکەوتە ئاخروخۆری هاوینی ساڵی داهاتوو.

ژیان سەخت و دژوار بوو. زستانەکەی هەروەک هی ساڵی پێشوو سەهۆڵبەندان و کرێوە بوو و خۆراکەکەش کەمی کردبوو زیادی نەکردبوو! جا دووبارە بێجگە لە بەراز و سەگەکان، بەشەخۆراکی هەموو ئاژەڵەکان کەم کرایەوە. سکویلەر ڕوونکردنەوەی دا: «بەرقەرارکردنی یەکسانییەکی تەواو لە بەشەخۆراکی ئاژەڵەکاندا، دژ بە بنەماکانی ئاژەڵیزم بوو.» گرنگ نەبوو کێشەکە چییە، چونکە سکویلەر هەمیشە بۆ ئاژەڵەکانی دەسەلماند کە لە ڕێژەی خۆراکدا هیچ کورتیان نەهێناوە. ئێستاکە دەبوو بەشەخۆراکەکان ڕێک بخرێنەوە (سکویلەر هەمیشە وەک ڕێکخستنەوە باسی دەکرد نەک کەمکردنەوە)، بەڵام بەراورد بە سەردەمانی جۆنس، گۆڕانکارییەکان گەورە بوون. سکویلەر بە خوێندنەوەی لیستەی ئامارەکانی خۆراک بە دەنگێکی بەرز و پێدانی ڕوونکردنەوە، بۆی دەسەلماندن کە لەچاو سەردەمی جۆنسدا، ئێستە وێنجە و کا و شێلمی زیاتریان هەیە، کەمتر کار دەکەن و ئاوی خواردنەوەکەیان پاکتر بووە، تەمەنێکی درێژتر دەژین،

ژمارەیەکی زیاتری بەچکەکانیان بە زیندووی دەمێننەوە، کای زیـاتر لە گەورەکانــدا بەردەســتە، هەروا بێـتەوە کەمتــریش بەدەست کێچەوە هەراسان دەبن. ئاژەڵەکان بڕوایان بە وشـە بە وشەی ئەم قسانە هەبوو. هەمووشی دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە هیچ شتێکی ئەوتۆیان سەبارەت بە ڕابردوو و کارەکانی جۆنس بیر نەمابوو. باش دەیانزانی کە ژیان لەم ڕۆژانەدا سەخت و پڕ لە چەرمەسەرییە و زۆربەی کات سکیان قۆڕەی دێت و سەرمایانە و کاتەکانی خەوی لێ دەر بکەیت، کەم کات هەیە خەریکی ئیشکردن نەبن! بەڵام هێشتاش دڵنیا بوون کە ڕابردوویان ڕەشتر و خراپتر بووە. لانی کەم دڵیان بەم جۆرە بیرکردنەوانەیان خۆش بوو. لە هەمووشی گرنگتر ئەوە بوو کە لە ڕابــردوودا کـۆیلە بــوون و ئێســتە ئـازادن، ئەمەش ئەو خاڵە بوو کە جیاوازییەکی گەورەی دروست دەکرد و سکویلەر هەرگیز باسکردن و ئاماژەپیکردنیی لە بیر نەدەکرد.

ئێستە دەبوو زگی زیاتر تێر بکرێن! ئەو زستانە چوار مالۆسەکە پێکەوە ترەکین و سی و یەک کۆلەیان خستنەوە. کۆلەکان ڕەش و سپی بوون و بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ناپلیۆن تاکە یەکانەیەکی مەزراکە بوو، خەملاندنی بنەچەی ئەم کـۆلانە کـارێکی گـران نەبــوو. دواتــر ڕاگەیەنــدرا کە هەر ئەوەندەی خشت و داری پێویست کڕرا، ژوورێکی وانەوتنەوە لە باخچەی خانووەکەدا دروست دەکرێت. لەو کاتەدا ناپلیۆن خۆی لە موبەقی خانووەکەدا ڕێنمایی دەدایە بێچووەبەرازەکان و ئەوانیش لە باخچەکەدا ڕاهێنانیان دەکرد، بەڵام نەیاندەوێرا تێکەڵ بە ئاژەڵەکانی دیکە ببن و یارییان لەگەڵ بکەن. لەم کاتەدا یاسایەکی نوێ دەرچوو، ئەویش ئەوە بوو کە هەرکات

ئاژەڵێک لە ڕێگەدا تووشی بەرازێک بوو، ئەوا دەبێت بچێتە کەنارەوە و ڕێی بۆ خۆش بکات، هەروەها هەموو بەرازەکانیش، جا لە هەر پلە و پۆستێکدا بن، دەبێت مافی ئەوەیان هەبێت کە ڕۆژانی یەکشەممە، قردێلەی سەوز بە کلکیانەوە ببەستن.

مەزراکە ساڵێکی سەرکەوتوو و باشی بەڕێ کرد، بەڵام هێشتاش لە پارەدا کورتی هێنابوو. دەبوو خشت و دار و گەچ بکڕن، تاکوو ژووری وانەوتنەوەکەی پێ دروست بکەن و لە لایەکی تریشەوە دەبوو خەمێکی مەکینەی ئاشەباکە بخۆن و پارەی بۆ پاشەکەوت بکەن. وەک چۆن دەبوو چرای نەوتی و مۆم و شەکری تایبەت بۆ مێزی ناپلیۆن دابین بکرێن (ناپلیۆن بە بیانووی قەڵەوبوونەوە، ڕێگەی نەدەدا بەرازەکانی دیکە شەکر بخۆن) لەگەڵ هەموو پێداویستییەکانی تری وەک بزمار و پەت و خەڵووز و وایەر و ئاسنەواڵە[١] و پسکیتی سەگەکان. بەشێک لە کا و پەتاتەکە فرۆشرا و گرێبەستی هێلکەکانیش بۆ شەش سەد هێلکە لە هەفتەیەکدا بەرز کرایەوە و ئەو ساڵە مریشکەکان بە زەحمەت وەک پێویست جوچکەیان هەڵهێنا تاکوو پارێزگاری لە ڕێژەی خۆیان بکەن. ئەو بەشەخۆراکەی لە مانگی کانوونی یەکەمدا کەم کرابووەوە، دووبارە لە کانوونی دووەمدا کەم کرایەوە و داگیرساندنی چراش لەپێناو دەستگرتن بە نەوتەوە، لە تەویلەکاندا قەدەغە کرا. بەڵام بەرازەکان مێشێک نەدەبووە میوانیان! پێدەچوو تاکە بارگرانییان، هەڵگرتنی زگی خۆیان بێت! لە ئێوارەیەکی

---

[١] کوتەئاسن، ئاسنی پارچەپارچەبوو. وردەئاسن کە بە مەبەستی جیا بەکار دەبرێن.

درەنگانی مانگی کانوونی دووەمدا، بۆن و بەرامەیەکی توند و خۆش، بە جۆرێک کە ئاژەڵەکان بە تەمەنیان بۆنی وا خۆشیان هەڵنەمژیبوو، لە کارگەی بیرەکەوە کە لە سەردەمی جۆنسەوە پشتگوێ خرابوو و دەکەوتە پشت مووبەقەکەوە، دزەی دەکردە نێو گۆڕەپانەکە و هەموانی سەرمەست دەکرد. یەکێکیان گوتی ئەوە بۆنی جۆی کوڵاوە. ئاژەڵەکان زگیان بە پشتیانەوە نووسابوو و لووتیان پڕ دەکرد لە هەوای ئەو ناوە و بیریان دەکردەوە کە ئەمە ڕەنگە ماش بێت و بۆ ژەمی شێوی ئەوان لێنرابێت. بەڵام هیچ ماشێک نەبوو بە نسیبیان و بۆ یەکشەممەی داهاتووش، ڕاگەیەندرا کە لەوەودوا هەموو جۆکە دەدرێ بە بەرازەکان و زەویی پشت ڕەزەکەش کرابووە جۆ. دواتر هەواڵ بڵاو بووەوە کە بەرازەکان هەموو ڕۆژ بوتڵێک بیرەیان پێ دەدرێت، ناپلیۆنیش نیو گالۆنی بۆ خۆی گل دەدایەوە و هەمیشەش لەگەڵ شۆربای سەرقاپداری کراون دێربیدا پێشکەشی دەکرا.

ئاژەڵەکان گەر ئاستەنگی و چەڵەمەیەکیان تووش ببووبا، بەرازەکان بەوە خۆیانیان لێ دەدزییەوە کە ژیانی ئێستەیان لەچاو ڕابردوودا، زۆر شەڕەفمەندانەترە. گۆرانی و لێدوان و ڕێوڕەسمی زیاتر لە ئارادا بوو. ناپلیۆن بڕیاری دا کە هەموو هەفتەی جارێک ڕێپێوانێکی خۆخوازانە ڕێک بخرێت، کە مەبەست لێی پیرۆزڕاگرتنی هەوڵ و سەرکەوتنەکانی مەزراکە بوو. لە کات و ساتێکی دیاریکراودا، دەبوو ئاژەڵەکان دەست لە کار هەڵبگرن و بە دەوری مەزراکەدا بکەونە مارشێکی سەربازییانە، بە جۆرێک کە بەرازەکان لە پێشەوە بن، ئینجا ئەسپەکان، جا مانگاکان و بە شوێن ئەوانیشدا مەڕومالات و

باڵنده و پەلەوەرەکـان بێن. سـەگەکان لەمـلا و لەولاوە پاسـی ئاژەڵەکانیـــان دەکـــرد و لەپـــێش هەرهەمووشـــیانەوە، کەڵەشـێرەکەی نـاپلیۆن مارشـی دەکـرد. بۆکســەر و کلۆڤەر هەمیشـە لە بەینـی خۆیانـدا ئـالایەکی سـەوزیان هەڵـدەگرت کە سـم و قـۆچ و درووشــمی "هەر بـژی هەڤـاڵ نــاپلیۆن"ی بەســەرەوە بــوو. لە دوابەدوای ئەمــانەدا دەســت دەکـرا بە وتـنەوەی ئەو شـیعرانەی کە بە شـانوباڵ و شـکۆی ناپلیۆنـدا هەڵدرابوون، دواتریش سنۆوبۆڵ دەکەوتە لێدوان سـەبارەت بە زیـادبوونی بەرهەمهێنـای خـۆراک و لە بۆنەکانیشـدا فیشـەکێک بە تفەنــگەکە دەتەقێنــدرا. مەڕەکــان حەیرانــی ئەم ڕێپێــوانە بووبـوون و گەر ئاژەڵێـک بکەوتبـا پرتەوبـۆڵە و گلەییکـردن (چونکە جاروبار هەندێک ئاژەڵ ئەگەر بیانزانیبا چـاوی سـەگ و بەرازەکانیـان لەسـەر نییە، دەیـانکرد) سـەبارەت بەوەی کە تەنیا کات بەفیرۆدانە و بە نـاهەق ئەو هەمـوو کاتە لە بەر ئەو سەرمایەدا ڕادەوەستن، مەڕەکان یەکسـەری لەڕێـی باعاندنێکی بەردەوامـی "چوارپێکـان خـراپن، دووپێکـان باشن!"ـەوە دەنگـی ئەم نارەزایەتییەیـان کـپ دەکـردەوە، بەڵام بە گشـتی بەشـی هەرە زۆری ئاژەڵەکـان چێژیـان لێـی دەبینـی. دواجـار دڵخـۆش بـوون بەوەی بیریـان بهێنـرێتەوە کە خۆیـان سـەردار و ئاغـای خۆیـــانن و هەمـــوو ئەو کـــارانەش کە کردوویـــانن، لە بەرژەوەندیی خۆیاندا بوون. بەڵێ، بەم جۆرە و لەڕێی گۆرانی، ڕێپێـوان، لیسـتەی خۆراکەکـانی سـکویلەر، نـاڵەی تفەنـگەکە، قوقەقـوقی کەڵەشـێرەکە و شـەکانەوەی ئـالاکە، لانـی کەم بـۆ ماوەیەک قۆرەقۆڕی زگی بەتاڵیانیان بیر دەچووەوە.

لە مانگی نیساندا مەزرای ئاژەڵان کۆماری خۆی ڕاگەیاند و لەم کاتەشدا پێویستی دەکرد سەرکردەیەک هەڵبژێردرێت. بێ گومان تەنیا یەک کاندید هەبوو، ئەویش ناپلیۆن بوو و بە کۆی دەنگ هەڵبژێردرا. هەر لە هەمان ڕۆژدا، دەرکەوت کە زانیاری و بەڵگەی تازە سەبارەت بە هاوکارییەکانی سنۆوبۆل لەگەڵ جۆنسدا، دۆزراونەتەوە. ئێستە ڕوون بووبووەوە کە سنۆوبۆڵ بە فێڵ و تەڵەکە، بەو جۆرەی کە ئاژەڵەکان بیریان لێ دەکردەوە، هەوڵی دۆڕاندنی شەڕی گەوڕەکەی نەدابوو! بەڵکوو ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە سەرکردایەتیی هێزە چەکدارەکانی مرۆڤی دەکرد و بە دروشمی "هەر بژی مرۆڤایەتی!" کە لەسەر زاری بوو، شەڕەکەی هەڵگیرساند. برینەکەی پشتی سنۆوبۆڵیش کە هێشتا هەندێک ئاژەڵ بیریان نەچووبووەوە، بەهۆی قەپاڵ و کەڵبەکانی ناپلیۆنەوە دروست بووبوو نەک فیشەک!

چلەی هاوین بوو و پاش دابڕانێکی چەند ساڵەیی، مۆزسی قەلەڕەش دەرکەوتەوە. مۆزس تۆزقاڵێک نەگۆڕابوو و هەروەک جاریجاران دەستی بۆ کار نەدەبرد و دەکەوتەوە باسی شاخی نەباتی. لەسەر کۆتەرە دارێک هەڵدەنیشت و باڵە ڕەشەکانیی لێک دەدان و بە کاتژمێر قسەی بۆ هەر ئاژەڵێک دەکرد کە گوێی بۆ بگرتبا. بە دەنووکە زلەکەی ئاماژەی بە ئاسمان دەکرد و زۆر جددیانە دەیگوت: «لەو سەرەوە هەڤاڵ، بەڵێ، لەو سەرەوە و هەر ڕێک لە لاکەی تری ئەو هەورە ڕەشەوەی کە دەیبینی، شاخی نەباتی هەیە. شارێکی تێدایە ئێمەی ئاژەڵ بۆ ئەبەد تێیدا دەحەسێینەوە و لە هەموو ڕەنج و مەینەتێک نەجاتمان دەبێت!» تەنانەت بانگەشەی ئەوەی دەکرد

که له یەکێک له گەشتە بەرزفڕەکانیدا، چاوی بە کێڵگە هەمیشەسەوزەکانی وێنجە و کێکی تۆوکەتان و کڵوە شەکرە ڕوواوەکانی سەر پەرژینەکان کەوتووە. زۆرێک له ئاژەڵەکان خۆشباوەڕانە بڕوایان پێ دەکرد. ئێستە کە ئاژەڵەکان ژیانێکی پڕ نەهامەتی و برسییەتییان دەگوزەراند، مافی خۆیان نەبوو کە بڕوا بە هەبوونی شوێنێکی باشتر بکەن بۆ ژیان؟ ئاژەڵەکان هیچ لە هەڵسوکەوتی بەرازەکان بەرانبەر مۆزس تێنەدەگەیشتن. بەردەوام پشتڕاسیان دەکردەوە کە چیرۆکەکانی مۆزس سەبارەت بە شاخی نەباتی درۆودەلەسەن و لە باخەڵی خۆیەوە دەریان دەهێنێت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەیان دەدا کە هەروا بێکار لە مەرزاکەدا بمێنێتەوە و ڕۆژانەش جیلێک[1] بیرەیان دەدایێ.

بۆکسەر پاش چاکبوونەوەی سمی، لە هەموو کات سەختتر کاری دەکرد. دواجار دەکرێت بڵێین کە ئەو ساڵە هەموو ئاژەڵەکان وەک کۆیلە کاریان کرد. سەرباری کاروبارە ئاسایی و ڕۆژانەییەکانی مەزرا و دروستکردنەوەی ئاشەباکە، قوتابخانەیەکی تایبەت بە کۆڵە بەرازەکانیش هەبوو کە لە ئاداردا دەست بە دروستکردنی کرابوو. هەندێک جار سەخت بوو بە زگی خاڵییەوە بەرگەی ئەو هەموو کاتژمێرە دووردرێژە بگیرێت، بەڵام بۆکسەر هیچ بە خەیاڵیدا نەدەهات! دەیگوت هیچ شتێک یان نیشانەیەک نییە بیسەلمێنێت کە هێز و توانای وەک جاران نەماوەتەوە. تەنیا شێوەی کەمێک گۆڕانکاریی بەسەردا هاتبوو: کوڵکەکەی وەک پێشووتر

---

[1] Gill: جیڵ یان پەرداخەچا، پێوانەییەکە کە دەکاتە ١١٨ میلیلیتر و چیدی بەکارناهێنرێت.

درەوشاوەیی نەمابوو و ڕانەکانیشی لەڕ بووبوون. ئاژەڵەکانی دیـــکە دەیـــانگوت: «لەگەڵ ســـەردەرهێنانی گیـــای بەهـــاردا، بۆکسەریش گوڕوتینی بە بەردا دێتەوە» بەڵام گیای بەهاریش سەوز بوو و بۆکسـەر هەروەک خۆی مـایەوە و قەڵەو نەبوو. هەنـــدێک جـــار بەســـەر ئەو هەورازەوەی کە بە ترۆپکـــی کانەبەردەکە دەگەیشت، لەژێر قورسایی گابەردێکی زەبەلاحدا هەموو ماسوولکەکانیی گرژ دەکردن و پێدەچوو ورەبەرزی و هیـوا تـاکە هۆکـاری مـانەوەی ئەو بـن لەســەر لاقەکـانی. لەو کاتـــانەدا ئاژەڵەکـــانی دیـــکە ســـەرنجیان دابـــوو کە لەژێـــر لێوەکـانییەوە دەورتێنێـت: «زیـاتر کـار دەکەم»، چـونکە چیتـر توانـای قسـەکردنی بە دەنگـی بەرز نەمـابوو. جـارێکی تـریش کلۆڤەر و بنجامین ئاگاداریان کردەوە کە هیچ نەبێ کەمێک لە خەمــی تەندروســتیی خۆیــدا بێــت، بەڵام بۆکســـەر گــوێی پــێ نەدەدان. دوانزەمین سـاڵی یـادی لەدایکبـوونی نزیـک بـووەوە و بۆکســـــەریش بـــێ لەوەی کە دڵنیـــا بێـــتەوە پـــێش خانەنشینبوونەکەی وەک پێویست بەرد کۆ کراوەتەوە، باکی بە هیچ شتێکی دیکە نەبوو.

درەنگوەختـانێکی ئێـوارەیەکی ڕۆژی هـاوین، کتـوپڕ دەنگـۆی ئەوە بە مەزراکەدا بڵاو بووەوە کە بۆکسەر بەڵایەکی بەسەردا هـاتووە. بە تـاقی تەنیا ڕۆیشـتبوو تـا بارەبەردێک لە کانەکەوە کـێش بکـاتە خـوار بـۆ لای ئاشــباکە. بەهەرحـاڵ، دەنگۆکـان ڕاست بوون. چەند خولەکێک دواتر، دوو کۆتر خێرا هـاتن و هەواڵێکیـان پێ بوو تـاکوو بە ئاژەڵەکـانی بگەیەنن: «بۆکسـەر بەربووەتەوە! بەسەر لایەکیدا کەوتووە و ناتوانێ هەستێتەوە!»

نیوەی ئاژەڵەکانی مەزرا بۆ سێودووکردن غاریان دایە شوێنی ئاشەباکە. بۆکسەر لەوێ کەوتبوو، لە مابەینی تەوەرەی عەرەباکەدا ملی گیر بووبوو و نەیدەتوانی تەنانەت سەریش بەرز بکاتەوە. چاوەکانی دەبریسکانەوە و لاکانی شەلالی ئارەقە بووبوون، دەزوولە خوێنێکی تەنکیش لە دەمییەوە هاتبووە دەرێ. کلۆڤەر لە تەنیشتییەوە بە چۆکدا هات و گوتی: «بۆکسەر! حاڵت باشە؟»

بۆکسەر بە دەنگێکی نووساوەوە گوتی: «سییەکانمن! کێشە نییە لێی گەڕێ! باوەڕم وایە کە بێ منیش بتوانن ئاشەباکە تەواو بکەن. بڕێکی باش بەرد کۆ کراوەتەوە و هەرچۆنێکیش بێ من هەر مانگێکی دیکەم لە بەردەمدایە. ئەوەی ڕاستی بێ بیرم لە خانەنشینبوون دەکردەوە. مادام بنجامینیش وا پیر دەبێ، باوەڕم وایە کە لە هەمان کاتدا بهێڵن ئەویش خۆی خانەنشین بکا و ببێتە هاودەمم.»

کلۆڤەر گوتی: «سەرەتا دەبێ داوای یارمەتی بکەین. خێرا یەکێکتان ڕا بکا و سکوێلەر ئاگادار بکاتەوە.»

ئاژەڵەکانی دیکە بە جارێک غاریان دایە خانووی مەزراکە، تاکوو هەواڵەکە بە سکوێلەر بگەیەنن. تەنیا کلۆڤەر و بنجامین مانەوە، بنجامین لە تەکییەوە مۆڵیبوو و بێ ئەوەی ورتەی لێوە بێت، بە کلکە درێژەکەی مێش و مەگەزی بە جەستەی بۆکسەرەوە دەردەکرد. پاش چارەکێک، سکوێلەر بە نیگەرانی و هاوسۆزییەکی زۆرەوە دەرکەوت. گوتی هەڤاڵ ناپلیۆن ئەم بەدبەختییەی کە بەسەر یەکێک لە بەوەفاترین ئاژەڵە ئیشکەرەکانی مەزراکەدا هاتووە، تەواو دڵگران بووە و

پێشـوەختە هەمـوو ئامادەکـارییەکی پێویسـتی گرتـووەتە بەر تـاکوو بۆکسـەر بنێردرێتە نەخۆشـخانەیەکی ویلینگتن و لەوێ تیمـار بکرێـت. ئاژەڵەکـان ئەم بیرۆکەیەیـان کەمێـک بە لاوە سـەخت بـوو. بێجگە لە مۆلی و سنۆوبۆل، هـیچ ئـاژەڵێکی تـر مەزراکەی جێ نەهێشتبوو و بە جۆرێک لە جۆرەکان حەزیان نەدەکرد هـاوڕێ بیمارەکەیان بکەوێتە بەر دەستی مرۆڤەکان. کەچـی سـکویلەر سـووک و ئاسـان قـایلی کـردن کە برینسازەکانی ڤێتەرنەری ویلینگتن لە مەزراکەی خۆیان باشتر دەتوانن برینەکانی بۆکسەر تیمار بکەن. نیو کاتژمێر دواتر و کاتێـک بۆکسـەر کەمێـک گـوڕوتینی بە بەردا هـاتەوە، بە ناڕەحەت هەستایەوە سەر پێ و شەلەشەل بەرەو تەویلەکەی خـۆی کەوتە ڕێ، کە لەوێ کلـۆڤەر و بنجـامین جێخەوێکـی باشیان لە کا بۆ ئامادە کردبوو.

دوو ڕۆژ دواتـریش، بۆکسـەر هەر لە تەویـلەکەی خۆیـدا مایەوە. بەرازەکان بوتڵێکی گەورەی دەرمانی پەمەییان نارد کە لە سـندووقی داودەرمانەکـانی گەرمـاوەکەدا دۆزیبوویـانەوە و کلۆڤەریش ڕۆژی دوو جار، پاش نانخواردن دەیدایە بۆکسـەر. ئێواران کلۆڤەر لە نزیکییەوە درێژ دەبوو و دەیدواند، بنجامیش مێش و مەگەزی لێ دەردەکرد. بۆکسـەر دانـی پێدا نـا کە هـیچ لەو کارەی پەشیمان نییە و ئەگەر بە باشی چاک ببێتەوە، ئەوا پێشبینی دەکا سێ ساڵی دیکەش بژی و لەو ماوەیەشـدا، بیری کـردووەتەوە کە بێـدەنگ و ئـارام ڕۆژەکـانی لە سـووچێکی لەوەڕگە گەورەکەدا بگوزەرێنێت. بۆ یەکەم جار بۆکسەر بێکار کەوتبـوو و کـاتی هەبـوو تـاکوو بخوێنێـت و گەشـە بە بیـری بدات. دەیگوت تەمای وایە ئەو ساڵانەی تەمەنی کە مـاونەتەوە،

بۆ فێربوونی بیستودوو پیتەکەی تری ئەلف و بێ تەرخان بکات.

بنجامین و کلۆڤەر تەنیا پاش تەواوبوونی کار دەیانتوانی لای بۆکسەر بمێننەوە و نیوەڕۆ بوو کاتێک عەرەبانەکە هات تاکوو بۆکسەر بەرێت. ئاژەڵەکان هەموو لەسەر کار بوون و لەژێر سەرپەرشتیی بەرازەکاندا سەرقاڵی ڕووتاندنەوەی هەرێزی نێو شێلمەکان بوون و کە بینییان بنجامین بە غاردان لە بیناکانی مەزراکەوە بەرەو ڕوویان دێت و زەرەزەڕی تا کەشکەشانی فەلەک دەچێت، واقیان وڕما. هیچ ئاژەڵێک لەوەوپێش گوێی لە زەڕەی بنجامین نەبووبوو. بنجامین هاواری کرد: «خێراکەن خێراکەن، هەمووتان وەرن، وا بۆکسەر دەبەن.» ئاژەڵەکان بێ ئەوەی مۆڵەت لە بەرازەکان وەربگرن، دەستیان لە کار هەڵگرت و بە غاردان بەرەو بیناگەلی مەزرا گەڕانەوە. بەڵێ دروست بەو جۆرە بوو، عەرەبانەیەکی گەورە لە گۆڕەپانەکەدا وەستابوو، بەسترابوو بە دوو ئەسپەوە و لاکانیشی شتیان بەسەرەوە نووسرابوو، کابرایەکی ڕواڵەت مەکراویش کلاوێکی بۆولەری تەپاندبووە سەری و لە شوێنی شۆفێر دانیشتبوو. تەماشایان کرد گەوڕەکەی بۆکسەریش خاڵییە.

ئاژەڵەکان لە دەوری عەرەبانەکە کۆ بوونەوە و پێکڕا بە کۆرسێک دەیانگوت: «ماڵئاوا بۆکسەر، ماڵئاوا!»

بنجامین بە دەوریاندا دەخولایەوە، بە سمە چکۆلەکانی سمکۆڵانی بوو و هاواری کرد: «هەی گەمژەینە! گەمژەینە!

کوڕە گەمژەینە! نابینن چی بەسەر لاتەنیشتی عەرەبانەکەوە نووسراوە؟»

قسەکەی بنجامین، ئاژەڵەکانی سەرسام و بێدەنگ وەستاند. موریڵ کەوتە حونجەکردنی وشەکان، بەڵام بنجامین بێئۆقرانە پاڵی پێوە نا و لەو بێدەنگییە بەسامەدا بەسەریەکەوە هەمووی خوێندەوە: «*ئەلفرێد سیمۆندس*، سەربڕی ئەسپ و کەتیرەسازی ویلینگتن. بازرگانی کەوڵ و ئێسکی هاڕدراو و دابینکەری کۆلیتی سەگ.»

«تێناگەن ئەمە یانی چی؟ وا بۆکسەر ڕادەستی قەساب دەکەن!»

ئاژەڵەکان لە ترساندا هاواریان لێ هەستا. لەو کاتەدا کابرا قامچیی بە ئەسپەکانیدا کێشا و عەرەبانەکە وردەوردە لە باخچەی مەزراکەوە بەرەو دەرەوە بەڕێ کەوت. ئاژەڵەکان هەموو شوێنی کەوتن و یەکبینە هاواریان دەکرد. کلۆڤەر غاری دا و پێش هەموویان کەوت و عەرەبانەکەش تا دەهات خێراتر دەبوو، هەوڵی دا گوڕوتینێک بداتە بەر دەست و پێیەکانی و چوارناڵ تێی تەقەنێت، سەرئەنجام چوارناڵەکەی خاو بووەوە. جا هاواری کرد: «بۆکسەر! بۆکسەر! بۆکسەر!» لەو کاتەدا بۆکسەر وەک ئەوەی گوێی لە هاتوهاوارەکەی دەرەوە بووبێت، ڕووخساری بە خەتە سپییەکەی سەر قەپۆزییەوە، لە پەنجەرەی دواوەی عەرەبانەکەدا دەرکەوت.

کلۆڤەر بە دەنگێکی سامناکەوە هاواری کرد: «بۆکسەر! وەرە دەرەوە! خێرا وەرە دەرەوە! دەیانەوێ بتکوژن!»

جا ئاژەڵەکان یەکدەنگ هاواریان دەکرد: «وەرە دەرەوە بۆکسەر، وەرە دەرەوە!» بەڵام عەرەبانەکە خێرا بووبوو و تا دەهات لەوان زیاتر دوور دەکەوتەوە. دیار نەبوو بۆکسەر گوێی لە هاتوهاوارەکەی کلۆڤەر بووە یان نا، بەڵام دواتر ڕووخساری بۆکسەر لە پەنجەرەکەدا ون بوو و زرموکوتێکی زۆری سمکۆڵان لەنێو عەرەبانەکەدا بەرز بووەوە. بۆکسەر هەوڵی هاتنەدەرەوەی دەدا. وای بۆ ئەو سەردەمەی کە بۆکسەر بە چەند لێدانێکی سم، عەرەبانەکەی وردوخاش دەکرد! بەڵام داخی گران کە ئەو گوڕوتینەی جارانی نەمابوو و زرموکوتەکەش تا دەهات کەمتر دەبووەوە، تا لە کۆتاییدا بە یەکجاری کپ بووەوە. دەستەوەستان و بێچارە، ئاژەڵەکان هانایان بردە بەر ئەسپەکانی عەرەبانەکە و لێیان پاڕانەوە کە بوەستن. هاواریان کرد: «هەڤاڵان! هەڤاڵان! براکەتان ڕادەستی مەرگ مەکەن!» بەڵام ئەوان زۆر لەوە فەحەتر بوون کە بزانن چی بە چییە، گوێیان بە پشتدا تەپاند و خێراتر غاریان دا. دەموچاوی بۆکسەر لە عەرەبانەکەدا دەرنەکەوتەوە. تازە درەنگ بوو، یەکێکیان بیرۆکەیەکی بە مێشکدا هات تا خێرا پێش عەرەبانەکە بداتەوە و دەروازە پێنجشیشییەکە دابخات، بەڵام عەرەبانەکە هەر زوو دەروازەکەی تێپەڕاند و لە ڕاستەڕێکە دوور و دوورتر دەکەوتەوە. ئیدی چاویان بە بۆکسەر نەکەوتەوە.

سێ ڕۆژ دواتر ڕاگەیەندرا کە وێڕای ئەو هەموو خزمەتەی کە دەکرا بە ئەسپێک بکرێت و کرا، بۆکسەر لە نەخۆشخانەی ویلێنگتندا مردار بووەوە. دواتر سکوێلەر هات تاکوو هەواڵەکە

به ئاژەڵەکان ڕابگەیەنێت. گوتی لە دواهەمین ساتەوەختەکانی گیانەڵای بۆکسەردا ئامادەگیی هەبووە.

سکویلەر سمی بەرز کردەوە تاکوو فرمێسکەکانی بسڕێت و گوتی: «کاریگەرترین و ناخهەژێنترین نیگا بوو کە تا ئێستە چاوم پێی کەوتبێ! تا دواخوولەک من لە تەک تەختەخەوەکەیەوە مامەوە. لە دواساتەکانی تەمەنیدا بە جۆرێک لاواز بووبوو کە نەیدەتوانی قسە بکات. بە گوێیدا چپاندم کە تاکە خەم و خەفەتی ئەوەیە بەر لە تەوابوونی ئاشەباکە پەکی کەوت. جا چپاندی: 'بۆ پێشەوە هەڤاڵان، بە ناوی یاخیبوونەوە بەرەو پێش. هەر بژی مەزرای ئاژەڵان، بژی هەڤاڵ ناپلیۆن، ناپلیۆن هەمیشە لەسەر هەقە!» ئەمانە دواهەمین قسەکانی بۆکسەر بوون.

لەم کاتەدا کتوپڕ هەڵسوکەوتی سکویلەر گۆڕا. بەر لەوەی دەست بە قسەکانی بکاتەوە، بە چاوە بچووکەکانییەوە خێراخێرا لەمسەر بۆ ئەوسەر چەند نیگایەکی گوماناوییانەی گرتنە ئامادەبووان.

پاشان گوتی کە ئاگاداری پڕوپاگەندەیەکی بێبنەمای هیچە کە سەبارەت بە گواستنەوەکەی بۆکسەر بڵاو بووەتەوە و هەندێک لە ئاژەڵان سەرنجی ئەوەیان دابوو کە ئەو عەرەبانەیەی بۆکسەری برد، ناوی 'سەربڕی ئەسپ'ی بەسەرەوە بووە و هەر زوو پێشداوەرییان کردووە کە بۆکسەر ڕادەستی قەساب کراوە. جا گوتی ناچێتە ئەقڵەوە ئاژەڵێک تا ئەو ڕادەیەش بێمێشک و گەمژە بێت کە بەو جۆرە بیر بکاتەوە. کلکەلەقێی دەکرد، لەمسەر بۆ ئەوسەر

هەڵدەبەزی، جا بە تووڕەییەوە گوتی: «یانی ئێوە ئاوا لە ڕابەرە خۆشەویستەکەتان تێگەیشتوون؟ بەڵام ئیدی بابەتەکەش بەو جۆرە ئاڵۆز نییە و ڕوونە. عەرەبانەکە پێشتر موڵکی قەسابێک بووە و دواتر لەلایەن ڤێتەرنییەوە کڕدراوەتەوە و بیریان چووە ئەو نووسینانەی سەری بسڕنەوە، هەڵەتێگەیشتنەکە ئالەمەدا بوو.»

زۆربەی ئاژەڵەکان کە ئەمەیان بیست، ئۆخژنێکیان هاتێ. کاتێکیش سکویلەر بەردەوامیی بە قسەکانی دا و زیاتر دیمەنی مردنی سەر تەختەخەوەکەی بۆکسەری بۆ ئاژەڵەکان وێنا کرد و باسی ئەو هەموو چاودێری و خزمەتە شیاوەی بۆ کردن کە پێشکەش بە بۆکسەر کراوە و هەڤاڵ ناپلیۆن بێ ئەوەی بیر لە نرخ و تێچووی دەرمانە گرانبەهاکانی بکاتەوە، دەمودەست هەقەکەی داون، کۆتا گومانی ئاژەڵەکان ڕەوییەوە و کە زانیشیان بۆکسەر مردنێکی شیاو مردووە هیچ بێتاقەتی و خەمێکیان سەبارەت بە چۆنییەتی مردنەکەی نەما.

ناپلیۆن لە کۆبوونەوەی یەکشەممەی داهاتوودا دەرکەوت و لەسەر شەرەفی بۆکسەر، کورتەوتارێکی بۆ ئاژەڵەکان دا. گوتی نەدەکرا تەرمەکەی بۆکسەر بهێننەوە و لێرە شیوەن و زاری بۆ بکەن و بینێژن، بەڵام وەک ڕێزێک بۆ کۆتا خواستی ئەو، داوای کرد تاجەگوڵینەیەکی گەورە لە داری تیرووی[1] باخچەی مەزرا دروست بکەن و دواتر لەسەر گۆڕەکەی

---

[1] تیروو: تیروێ؛ دارێکە بەرزییەکەی دەگاتە ١٠ تا ١٥ مەتر، قەدێکی ڕێک و لووسی هەیە، گەڵاکانی هێلکەیین و گوڵی سپی و سەوز دەگرێت و بەرەکەشی بەقەد دەنکە نۆکێک دەبێت.

دابنێن. لە ماوەی چەند ڕۆژی دواتردا، بەرازەکان بڕیاریان دا کۆڕێکی ماتەمینی بۆ بۆکسەر ڕێک بخەن. بۆ بۆکسەر ساز بدەن. ناپلیۆن بە زیندووکردنەوەی دوو درووشمەکەی بۆکسەر "زیاتر کار دەکەم" و "ناپلیۆن هەمیشە لەسەر هەقە"، کۆتایی بە قسەکانی هێنا. جا گوتی لەسەر هەموو ئاژەڵێک پێویستە ئەم درووشمانە بکاتە وێردی سەر زاری.

ئەو ڕۆژەی کە وا بڕیاربوو سفرەخوانەکە ساز بدرێت، عەرەبانەیەک لە ویلینگتنەوە هات و سندووقێکی گەورەی لە بەردەم خانووی مەزراکەدا داگرت. ئەو شەوە دەنگی گۆرانیوتن و ژاوەژاوێکی زۆر بەرز بووەوە و دواتریش دەنگی دەمەقاڵێیەکی توندی بەدوادا هات، تا لە کاتژمێر یانزەدا و بە زرمەی شکانی شووشەیەک هەمووی کۆتایی هات. بەیانیی ڕۆژی دواتر، تا نیوەڕۆش هیچ بەرازێک دەرنەکەوت. دواتر دەنگۆیەک بڵاوە بووەوە گوایە بەرازەکان لە شوێنێک پارەیان قەرز کردووە و سندووقێک ویسکییان بۆ خۆیان پێ کڕیوە.

## بەشی دەیەم

ساڵان تێپەڕین. وەرزەکان دەهاتن و دەچوون و تەمەنی کورتی ئاژەڵەکانیش لەگەڵیاندا ڕادەبوورد. سەردەمێک هاتە پێش کە جگە لە کلۆڤەر و بنجامین و مۆزسی قەلەڕەش و چەند بەرازێک، هیچ ئاژەڵێک بچووکترین سەرەداویشی سەبارەت بە ڕۆژانی پێش یاخیبوونەکە لە بیر نەمابوو.

موریڵ و بلوبێڵ و جێسی و پینچەر تۆپیبوون. جۆنسیش بە هەمان شێوە، بە سەرخۆشی و لە مەیخانەیەکی سووچێکی دیکەی ئەو وڵاتەدا، مردبوو. سنۆوبۆڵ لەبیر کرابوو و بۆکسەریش بێ لەو چەند ئاژەڵە کەمەی کە دەیانناسی، بە تەواوی لەلایەن ئاژەڵەکانەوە فەرامۆش کرابوو. ئێستە کلۆڤەر ماینێکی قەڵەو بوو، جومگەکانی وشک داهاتبوون و بەدەست ئاوکردنی چاوەکانییەوە داد و بێدادی بوو. دوو ساڵ بەسەر تەمەنی خانەنشینبوونیدا تێپەڕیبوو، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە هیچ ئاژەڵێک خانەنشین نەکرابوو! قسە و بەڵێنە باقوبریقەدارەکان سەبارەت بە دابینکردنی بەشێکی لەوەڕگە گەورەکە بۆ ئاژەڵە خانەنشینبووەکان، لەمێژ بوو پشتگوێ خرابوو. ناپلیۆن هەنووکە یەکانەیەکی پێگەیشتووی بیستوچوار ستۆنی بوو، سکویلەریش هێندە قەڵەو بووبوو کە بە ئاستەم بەردەمی خۆی دەدیت. تەنیا بنجامینی پیر کەم تا زۆر وەک خۆی مابووەوە، هەر ئەوە بوو کە قەپۆزی بۆرتر بووبوو و لە

دوای مەرگی بۆکسەریشەوە، لە هەموو کات زیاتر خەمگین و کەمدوو بوو.

ئێستە ژمارەیەکی زۆری ئاژەڵی تازە لە مەزراکەدا هەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم زیادبوونی ژمارەی ئاژەڵانە، بەو ڕادەیەش بەسوود و باش نەبوو کە لە ساڵانی ڕابردوودا پێشبینیی دەکرا. بۆ هەندێک لەو ئاژەڵانەی کە تازە لە دایک بووبوون، یاخیبوون تەنیا نەریتێکی تەمومژاوی بوو کە دەماودەم و زارەکی بۆیان گواسترابووەوە، هەرچی ئەو ئاژەڵانەش بوون کە کڕدرابوون، هەرگیز پێش هاتنیان گوێیان لە وەها شتێک نەبووبوو. ئانوسات مەزراکە بێجگە لە کلۆڤەر، سێ ئەسپی دیکەشی تێدا بوو. ئەم ئەسپانە ئاژەڵی بەهێز و ئیشکەر و هەڤاڵی باش بوون، بەڵام ئێجگار گەمژە بوون. دەرکەوت هیچ یەکێکیان لە توانایدا نییە کە لە پیتی Bبەولاوە فێر ببێت. هەموو ئەو شتانەیان قبووڵ دەکرد کە سەبارەت بە بنەماکانی ئاژەڵیزم و یاخیبوون پێیان دەگوترا، بە تایبەت ئەگەر لەلایەن کلۆڤەرەوە بووایە، چونکە بە ڕێزێکی زۆرەوە و وەک دایکیان لێیان دەڕوانی، بەڵام دیار نەبوو کە ئایا سەر لە قسەکانی دەردەکەن یاخود نا.

ئێستە مەزراکە سەرکەوتووتر و ڕێکخراوتر بوو و پاش کڕینی دوو لەوەڕگەش لە پیلکینگتن، ڕووبەرەکەی فراوانتر بووبوو. دواجار ئاشەباکە سەرکەوتووانە تەواو کرا و مەزراکە ئامێری دروێنە و بەرزکەرەوەی کای تایبەت بە خۆی بەدەست هێنا، هاوکات چەندان بینای تازەش کرابوونەوە و ویمپەریش گالیسکەیەکی بۆ خۆی کڕیبوو. بەڵام سەرباری ئەمانەش، ئاشەباکە بە هیچ جۆرێک بۆ دابینکردنی وزەی کارەبا بەکار

نەدەهـات، بەڵكـوو بـۆ هـاڕینی دانەوێـڵە بەكاریـان دەهێنـا و قـازانجێكی زۆر باشـیان لیـوە بەدەسـت دەهێنـا. ئاژەڵەكـان بە سەختی كاریان لە دروستكردنی ئاشـەبایەكی دیكەدا دەكرد و دەگــوترا پــاش تەواوبــوونی ئەوەیــان، دینەمــۆی بــۆ دادەمەزرێنرێــت. بەڵام ئەو خزمەتگوزاریـانەی كە سـنۆوبۆڵ پێشتر خستبوونییە مێشكی ئاژەڵەكانەوە تاكوو خەونیان پێوە ببینن، وەك كارەبای تەویلەكان و ئاوی گەرم و سارد و سێ ڕۆژ پشـوو لە هەفتەیەكدا، چیدی باس نەدەكران. ناپلیۆن ئەم جــۆرە بیركــردنەوانەی بە بیرۆكەگەلــی دژ بە سرووشــتی ئــاژەڵیزم لە قەڵەم دەدان. بە قســەی ئەو، خۆشــبەختیی ڕاستەقینە لە كاركردنی سەخت و ژیانی سادەدا بوو.

مەزراكە بە جۆرێـك لە جۆرەكـان تـا دەهـات دەوڵەمەنـدتر دەبــوو، بەڵام ئاژەڵەكــان لەگەڵیــدا دەوڵەمەنــد نەدەبــوون و هەروەك خۆیــان مــابوونەوە، هەڵــبەت بــێجگە لە بەراز و ســەگەكان. بــێ گومــان ڕەنــگە هۆكارەكەشــی هەر بــۆ ئەوە بگەڕێتەوە كە ژمـارەیەكی زۆری سـەگ و بەراز لە مەزراكەدا هەبوون. بابەتەكە ئەوە نەبوو كە ئەم ئاژەڵانە لەئاست خۆیاندا كاریـان نەدەكرد! بەڵكـوو هەمیشـە (وەك سـكوێلەر هەرگیـز لە وتــنەوە و ڕوونكــردنەوەی وەڕەس نەدەبــوو) كــارێكی زۆروزەبەندی سەرپەرشتی و ڕێكخستنی مەزراكە بەسـەریاندا كەوتبـوو. زۆربەی ئەم ئیشـوكارانەش لەو جـۆرانە بـوون كە ئاژەڵەكـان زۆر لەوە كەمژەتـر بـوون تێیـان بگەن. بـۆ نمـوونە سـكوێلەر پێـی دەگـوتن دەبێـت هەمـوو ڕۆژێـك بەرازەكـان وزەیەكی زۆر لە هەندێك شتی ئاڵۆزدا بەگەڕ بخەن، كە پێیـان دەگـوترا: فایـل، ڕاپـۆرت، نووسـراو و یادداشـتنامە. ئەمـانە

پەڕەکاغەزی گەورە بوون کە دەبوو زۆر ورد بە نووسین پڕ بکرێنەوە و دوای ئەوەش بە تەواوی ڕەش دەکرانەوە، لەنێو فڕنەکەدا دەسووتێنران. سکویلەر دەیگوت کە ئەمانە گرنگییەکی زۆریان لە چاودێریکردنی مەزراکەدا هەیە. بەڵام هێشتاش هیچ بەراز و سەگێک، بە ڕەنجی شانی خۆی خۆراکی بەرهەم نەدەهێنا و وێڕای زۆریی ژمارەیان، هەمیشە هازی خواردنیان هەبوو.

ژیانی ئاژەڵەکانی دیکەش، تا ئەو ڕادەیەی ئاگادار بوون، هەروەک پێشوو بوو. زۆربەی کات برسی بوون و بەسەر کاوە دەنووستن، لە ئەستێڵەکە ئاویان دەخواردەوە و لە زەوی و کێڵگەکاندا ئەرکیان دەکێشا، زستانان بەدەست سەرماوسۆڵەوە گیریان دەخوارد و هاوینانش بەدەست مێشومەگەزەوە. هەندێک جار پیرەئاژەڵەکانی نێویان، هەموو گوشارێکیان لە یادگەی لێڵ و تەمومژاوییان دەکرد تا بزانن ئاخۆ گوزەران و ژیانیان لە ڕۆژانی سەرەتای یاخیبوون و ئەو کاتەی کە تازەبەتازە جۆنسیان دەرکردبوو، لە ئێستە باشتر بوو یاخود نا. بەڵام لە بیرهێنانەوەی ئەو ڕۆژانەدا، شکستیان دەهێنا. هیچ سەرەداوێک، شتێکیان شک نەدەبرد تاکوو ژیانی ئێستەیانی پێ بەراورد بکەن، لیستەی بەرهەمە خۆراکییەکانی سکویلەری لێ دەرچێت کە جێگیر و نەگۆڕانە بەردەوام پشتڕاستیان دەکردەوە کە تا دێت هەموو شت باشتر دەبێت، هیچ بەڵگەیەک نەبوو پشتی پێ ببەستن. بۆ ئاژەڵەکان ئەمە کێشەیەکی چارەسەرنەکراو بوو؛ لەگەڵ ئەوەشدا لەم ڕۆژانەدا ئەوەندە کاتیان لە بەردەستدا نەبوو، تاکوو سەریان بپرژێتە سەر ئەم بابەتانە. تەنیا بنجامینی پیر بانگەشەی ئەوەی دەکرد

که هەموو وردەکارییەکانی ژیانی دووورودرێژی خۆی لە یادە و دەزانێت کە شتەکان نە خراپتر بوون و نە باشتر و نە دەشکرا باشتر یان خراپتر بین! دەیگوت کە برسییەتی و کاری قورس و نائومێدی بەشێکن لە یاسای نەگۆڕی ژیان.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئاژەڵەکان هەرگیز نائومێد نەبوون و تەنانەت بۆ چرکەساتێکیش ئەو هەستی شانازی و مافی بوونە ئەندامی مەزرای ئاژەڵانیان ون نەدەکرد. هێشتاش تاکە مەزرا بوو کە لە سەرتاسەری وڵاتەکەدا (لە هەموو ئینگلتەرادا) بەدەست ئاژەڵانەوە بێت و هەر لەلایەن ئەوانیشەوە بەڕێوە ببرێت. هیچ ئاژەڵێک تەنانەت گەنجترینیان و ئەوانەش کە تازە لەو مەزرایانەوە هێنرابوون کە دە بیست میلێک دوور بوون، نەیدەتوانی لەبەرانبەر ئەم ڕاستییەدا نەحەپەسێت. کاتێک گوێیان لە ناڵەی تەقاندنی فیشەک دەبوو و چاویان بە ئاڵا سەوزەکە دەکەوت کە بە سەری دارئاڵاکەوە دەشەکێتەوە، دڵیان لە شانازییەکی نەبڕاوە لێوڕێژ دەبوو و قسەکان دەبرانەوە سەر ڕۆژانی دێرینی قارەمانێتییان، وەدەرنانی جۆنس، نووسینەوەی حەوت یاساکە و ئەو شەڕە مەزنانەی کە تێیاندا مرۆڤە داگیرکارەکانیان بەزاندن. هاوکات هیچ خەون و ئاواتێکی پێشووتر لەبیر نەکرابوو. هێشتا بڕوایان بەو کۆماری ئاژەڵانە هەبوو کە لەلایەن مەیجەری پیرەوە پێشبینی کرابوو و دەبوو دووپێی هیچ بنیادەمێکی نەکەوێتە سەر. بۆ کوێ دەچی! هەر ڕۆژێک ئەم کۆمارە پێک دەهات، ڕەنگە لە داهاتوویەکی نزیکدا نەبێت، ڕەنگە لە ماوەی ژیان و تەمەنی هیچ یەک لەو ئاژەڵانەشدا نەبێت کە ئێستاکە زیندوون، بەڵام بێ گومان هەر پێک دەهات! تەنانەت ئاوازی 'ئاژەڵانی

ئینگلتەرا" لە نێویاندا مابووەوە و پێدەچوو لێرە و لەوێ بە دزییەوە بیچڕن، ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر بوو کە هەموو ئاژەڵەکانی مەزرا بەم ئاوازە ئاشنا بوون، لەگەڵ ئەوەشدا هیچیان زاتی ئەوەیان نەدەکرد بە ئاشکرا بیچڕن. ڕاستە ژیانێکی دژواریان تێدەپەڕاند و هەموو ئاوات و هیوایەکیشیان نەهاتبووە دی، بەڵام هاوکات ئاگادار بوون کە وەک ئاژەڵانی دیکە نین. لانی کەم ئەگەر برسییان بووایە، ئەوا بەهۆی تێرکردنی ورگی مرۆڤە ستەمکارەکانەوە نەبوو، ئەگەر بە سەختی کاریان بکردبا، ئەوا تەنیا و تەنیا لە بەرژەوەندیی خۆیاندا بوو و هیچ بوونەوەرێکیش لە نێویاندا لەسەر دوو پێ ڕێی نەدەکرد. هیچ بوونەوەرێک ئەوی دیکەی بە "گەورە" بانگ نەدەکرد، هەموو ئاژەڵەکان یەکسان بوون.

لە ڕۆژێکی سەرەتای هاویندا سکویلەر داوای لە مەڕەکان کرد شوێنی بکەون، دواتر بردنیيە زەوییەکی بێکەڵکی لایەکی دیکەی ئەوسەری لەوەڕگەکە کە نەمامەدرەختی دارەسپی تێدا ڕوابوون. مەڕەکان لەژێر سەرپەرشتیی سکویلەر و بە درێژایی ڕۆژەکە، دەستیان کرد بە لەوەڕین و خواردنی گەلاکان. دەمەوئێواران خۆی دەگەڕایەوە مەزراکە، بەڵام بە بۆنەی ئەوەی کە کەش گەرم بوو و مەڕەکان کێشەیان نەبوو، فەرمانی پێ دەکردن هەر لەوێ بمێننەوە. بەم جۆرە مەڕەکان تەواوی ئەو هەفتەیە لەوێ مانەوە و ئاژەڵەکانی تریش بە هیچ شێوەیەک چاویان پێیان نەدەکەوت. سکویلەر نزیکەی تەواوی ڕۆژەکە لەگەڵیان دەمایەوە و گوتی کە ویستوویەتی سروودێکی تازەیان فێر بکات و بۆ ئەم کارەش پێویستیی بە تەنیایی و خەڵوەت هەبووە.

ئێوارەیەکی دڵڕفێن، دروست پاش ئەوەی مەڕەکان هاتنەوە و ئاژەڵەکـــــان وردەوردە دەگەڕانەوە بینـــــاگەلی مەزراکە، حیلەیەکی سامناکی ئەسپ لە حەوشەی مەزراکە بەرز بووەوە. ئاژەڵەکان ڕاچڵەکین و لە شوێن خۆیاندا وشک بوون. بەڵێ، دەنگی کلۆڤەر بوو. دووبارە حیلاندی و ئاژەڵەکان خێرا غاریان دایە حەوشەکە. دواتر ئەو دیمەنەیان بینی کە کلۆڤەر بینیبووی.

بەرازێک لەسەر دوو پێ دەڕۆیشت.

بەڵێ، سکویلەر بوو. کەمێک ناقۆلا و لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕانەهاتبوو لەو بارەدا کێشی قورسی لەشی ڕابگرێت، بەلام تا ڕادەیەکی زۆر باش، هاوسەنگ بە حەوشەی مەزراکەدا ڕێی دەکرد. ساتێک دواتر و لە دەرگەی خانووی مەزراکەوە، ڕیزێک بەراز هاتنە دەر و گشتیان لەسەر دوو پێ ڕێیان دەکرد. هەندێکیان لەوانی دیکە باشتر بوون و یەک دووانێکیشیان هێندە لاسەنگ و گەوجانە ڕێیان دەکرد کە پێدەچوو پێویستیان بە گۆچانێک بێت تاکوو خۆیانی پێ ڕابگرن، بەلام دواجار هەموویان ڕێکوپێک بە دەوری حەوشەی مەزراکەدا سووڕانەوە. جا لە کۆتاییدا حەپەحەپی سەگەکان و قووقەقووقی کەڵەشێرە ڕەشەکە بەرز بووەوە، ناپلیۆن خۆی هاتە دەر، قنج و قیت وەستابوو، نیگایەکەی لووتبەرزانەی لەمسەر بۆ ئەوسەر گرتە ئامادەبووان و سەگەکانیش بە دەوریدا دەسووڕانەوە.

بە سمی قامچییەکی گرتبوو.

بێدەنگییەکی بەسام باڵادەست بوو. واقورماو و تۆقیو، ئاژەڵەکان خۆیان ترانجدبووە تەنیشت یەک و تەماشای مارشی ئەو ڕیزە بەرازەیان دەکرد کە بە دەوری حەوشەکەدا دەسووڕانەوە. دەتگوت هەموو جیهان سەرەونخوون بووەتەوە. پاشان ئەو ساتە هات کە یەکەمین تەزوو و شەپۆلی سەرسوڕمان ئاژەڵەکانی بەردا و سەرباری هەموو شتێک - وێڕای ترسیان لە سەگەکان و ئەو خوو و ڕەفتارەی کە بە درێژایی ساڵانی ڕابردوو لەسەری ڕاهاتبوون کە سەبارەت بە هیچ بابەتێک متەقیان لێوە نەیەت و ڕەخنە نەگرن- دەکرا بە هەندێک وشە نارەزایەتیی خۆیان دەربڕن، بەڵام ڕێک لەو کاتەدا و بە ئاماژەیەک، هەموو مەڕەکان پڕ بە گەروویان کەوتنە باعاندنی: «چوارپێکان باشن، دووپێکان باشترن! چوارپێکان باشن، دووپێکان باشترن! چوارپێکان باشن، دووپێکان باشترن!»

باعەباعەکە هەروا پێنج خولەک بێ وەستان بەردەوام بوو. کاتێکیش مەڕەکان وەستان، ئیدی دەرفەتی هیچ نارەزایەتیدەربڕینێک نەمابووە و بەرازەکان ڕۆیشتبوونەوە ژووری.

بنجامین هەستی کرد قەپۆزێک بەسەر شانیدا دەخشێت. ئاوڕی دایەوە و بینیی کلۆڤەرە. چاوەکانی لە هەموو کات زیاتر لێڵ و ناڕوون بوون. بێ ئەوەی زاری بکاتەوە، بە نەرمی یاڵی بنجامینی ڕاکێشا و بردییە پشتەوەی تەویلە گەورەکە، ئەو شوێنەی کە حەوت یاساکە بەسەر دیوارەکەوە نووسرابوون. خوولەکێک و دووان هەروا بێدەنگ ڕاوەستان و لەو دیوارە قیراوییەیان ڕوانی کە نووسینی سپیی بەسەرەوە بوو.

له کۆتاییدا کلۆڤەر گوتی: «بینیاییم لیله و باش نابینم. تەنانەت ئەو کاتانەش کە گەنج بووم، نەمدەتوانی ئەم نووسینانە بخوێنمەوە. بەڵام هەست دەکەم گۆڕاون! پێم بڵێ بنجامین، ئایا حەوت یاساکە وەک خۆیانن؟»

بۆ یەکەم جار، بنجامین خووی بێدەنگیی خۆی شکاند و ئەو نووسینانەی خوێندنەوە کە بەسەر دیوارەکەوە نووسرابوون. ئێستە دیوارەکە تەنیا یەک یاسای بەسەرەوە بوو و بەم جۆرە بوو:

هەموو ئاژەڵەکان یەکسانن

بەڵام هەندێکیان لەوانی دی یەکسانترن

پاش ئەمە، ئیدی بۆ ڕۆژی دواتر هیچ مایەی سەرسامی نەبوو کە ئەو بەرازانەی سەرپەرشتیی کاروبارەکانیان دەکرد، قامچیان پێ بێت. سەیر نەبوو بزانیت بەرازەکان بێتەلیان کڕیوە و بەتەمان تەلەفۆن دابنێن و بڵاوکراوەکانی جۆن بول[1] و تیت بیتس[2] و دەیلی میرەر[3] دەرهێناوە. نەخێر، بە هیچ لۆنێک سەیر نەبوو کە ببینیت ناپلیۆن سەبیلێکی بە دەمەوەیە و بە باخچەی خانووەکەدا پیاسە دەکات، یان ئەوەی کە بەرازەکان هەموو جلەکانی بەڕێز جۆنسیان لە دۆلابەکە دەرهێناوە و پۆشیویانن. ناپلیۆن بە چاکەتێکی ڕەش و پانتۆڵێکی تایبەت بە ڕاوەڕێوی و پووزەوانەی چەرمەوە دەرکەوت، لە بارێکدا مالۆسە دڵخوازەکەی، ئەو کراسە

---

[1] John bull
[2] Tit bits
[3] Daily mirror

ئاوریشــمییە شــەپۆلدارەی لە بەردا بــوو کە خــاتوو جــۆنس یەکشەممان دەیپۆشی.

هەفـتەیەک دواتــر و ســەرلەئێوارەیەک، کۆمەڵێـک گالیســکە هــاتنە مەزراکە. بریکــارانی مەزراکــانی دراوســێ نێردرابــوون تــاکوو مەزرای ئــاژەڵان ببشــکنن. تەواوی مەزراکەیــان نیشــان درا و پــڕ بە دڵ لە هەمــوو شــتەکان ڕازی بــوون، بە تــایبەت ئاشــەباکە. لەو کــاتەدا ئاژەڵەکــان خەریکــی ڕووتانــدنەوەی هەرێزی نێو کێڵگەی شێلمەکە بوون. بە سەختی کاریان دەکرد و بە دەگمەن ســەیریان بەســەر زەوییەکەوە بەرز دەکــردەوە، خۆیشیان نەیاندەزانی، لە مرۆڤە سەردانکەرەکان زیاتر بترسن، یاخود لە بەرازەکان.

بــۆ ئێــوارەکەی قاقــای پێکەنــین و هەرای وتنــی گــۆرانی لە خــانووەکەدا بەرز بــووەوە. کتــوپڕ بەهــۆی ژاوەژاو و دەنــگە تێکەڵبــووەکەوە، ئاژەڵەکــان کونجکــۆڵ و ســەرســام ڕامــان. تــۆ بڵێیت ئێستە کە مــرۆڤ و ئاژەڵەکان لەســەر بنەمــای یەکســانی کۆ بوونەتەوە، لە ژوورەوە چی بگوزەرێ؟ گشتیان پێکەوە، بە پارێز و وریاییەکی زۆرەوە دزەیان کردە حەوشەی خانووەکە.

کاتێک گەیشــتنە دەروازەکە، دووڵ و ترســاو لەوەی کە بچنە ژوور یاخود نا، وەستان، بەڵام کلۆڤەر چووە ژوورێ و ترســی شــکاندن. بە پێــدزکە لە خــانووەکە نزیــک کەوتــنەوە و ئەو ئاژەڵانەشــی کە بەرز بــوون، ئاســان دەیــانتوانی لە پەنــجەرەی ژووری میوانەکەوە تەماشــای ناوەوە بکەن. لە ژوورەوە و بە دەوری مێزەکەدا، شــەش جووتیــار و شــەش بەرازی شــکۆمەند دانیشــتبوون و نــاپلیۆن خۆیشــی لە ســەرووی هەموویــانەوە

لەسەر کورسیی شکۆ، دانیشتبوو. بەرازەکان کە بەو جۆرە لەسەر کورسییەکان دانیشتبوون، زۆر خۆشکەیف و ئاسوودە دیار بوون. میوانەکان چێژیان لە یاریی وەرەق دەبینی، بەڵام بۆ ساتێک وەستان، تاکوو پێکێکی دیکە پێکەوە هەڵبدەن. سوراحییەکی گەورەیان دەستاودەست پێ دەکرد و هەموو پەرداخەکان پڕکرانەوە لە ئاوجۆ. هیچ کەس سەرنجی ڕووخساری سەرسامداگەڕاوی ئاژەڵەکانی نەدا کە لە پەنجەرەکەوە تەماشایان دەکرد.

بەڕێز پیلکینگتنی مەزرای فۆکسوود هەستابووە سەر پێ و پەرداخەکەی بە دەستەوە بوو. گوتی کەمێکی دی داوا لە ئامادەبووان دەکات تاکوو پێکڕا بخۆنەوە، بەڵام بەر لەوە هەندێک قسە هەن کە ئەگەر نەیانکات، ئەوا دڵی دەتەقێت.

گوتی ئەمە مایەی دڵخۆشییەکی بێهاوتایە بۆ ئەو و ئامادەبووانیش دڵنیا دەکاتەوە کە سەردەمی دووروودرێژی بەدگومانی و هەڵەتێگەیشتن کۆتایی هات. سەردەمانێک نەک تەنیا خۆی، بەڵکوو هیچ یەک لە ئامادەبووانیش وەها هاوسۆزی و هاودڵییەکیان لەگەڵ یەکدیدا بەش نەدەکرد. بەڵام سەردەمێک خاوەنە گرانقەدرەکانی مەزرای ئاژەڵان، لەلایەن مرۆڤە دراوسێکانیانەوە (نەیگوت بە چاوێکی دژمنانەوە، بەڵکوو گوتی بە جۆرێک لە ترسەوە) بەدگومانانە تەماشا دەکران. ڕووداوی شووم و خراپ ڕوویان دا و ئاسایی بوو کە بیرۆکەی هەڵە بە مێشکی مرۆڤدا بێت. هەست دەکرا هەبوونی مەزرایەک کە بەرازەکان خاوەنی بن و هەر لەلایەن ئەوانیشەوە سەروکاریی بکرێت، تا ڕادەیەک نائاسایی بێت و کاریگەرییەکی خراپ و نەرێنی لەسەر دەوروبەرەکەی دابنێت.

زۆربەی هەرە زۆریی خاوەنمەزراکانی دیکە، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە بێت، باوەڕیان وا بوو کە ئاکار و سرووشتێکی بێباک و بێسەروبەرانە لە مەزراکەدا باڵادەستە. خەمی ئەوەیان بوو کە ئاژەڵەکان و تەنانەت فەرمانبەرەکانیشیان بکەونە ژێر ئەو کاریگەریانەوە، بەڵام ئەمڕۆ ئیدی تەمی هەموو ئەو گومانانە ڕەوییەوە. ئەمڕۆ خۆی و هاوڕێکانی سەردانی مەزرای ئاژەڵانیان کردبوو و بە چاوانی خۆیان، لە ئینج بە ئینجی ورد بووبوونەوە، جا چیان دیبێت باشە؟ تەنیا ڕێگە و شێوازی تازە نا، بەڵکوو ڕێکوپێکی و ڕێکخستنێک کە دەبێت ببێتە نموونەیەکی زۆر باش بۆ هەموو خاوەنمەزراکانی دونیا. هاوکات پێی وابوو ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبێت، ئەوا ئاژەڵە پلەنزمەکانی مەزرای ئاژەڵەکان لە هەموو ئاژەڵێکی دیکەی دونیا بەشەخۆراکی کەمتریان هەیە. بەهەرحاڵ خۆی و دۆستانی دیکەی، چەندان شتی بەکەڵک فێر بوون کە دەیانویست یەکسەری لە مەزراکانی خۆیاندا جێبەجێیان بکەن.

دواتر گوتی دەیەوێت بە جەختکردنەوە لەسەر ئەو پەیوەندییە دۆستانەیەی کە لەنێوان مەزرای ئاژەڵان و مەزراکانی دراوسێدا دروست بووبوو و هەر دەبوو بەو جۆرەش بمێنێتەوە، کۆتایی بە وتارەکەی بهێنێت. لەنێوان مرۆڤ و بەرازەکاندا هیچ ناکۆکییەک نەبووە و نابێت هەشبێ، چونکە خۆشی و ناخۆشییان هەر یەکێکە. مەگەر کێشەی زەحمەتکێشان و کارکردن لە هەموو شوێنێکی ئەم سەرزەمینە وەک یەک نییە؟ لەم کاتەدا ئاشکرا دیاربوو کە بەڕێز پیلکینگتن دەیەوێت نوکتەیەکی خۆش بۆ ئامادەبووان بگێڕێتەوە، بەڵام بۆ

سـاتێک هێنـده خرۆشـابوو که نه‌یـده‌توانی بیڵێـت. پـاش خۆخـواردنه‌وه‌یه‌کی زۆر و په‌مه‌ییهه‌ڵگه‌ڕانـی چه‌نـاگه چـین-چینه‌که‌ی، دواجار توانیی بیڵێت: «گه‌ر ئێوه ئاژه‌ڵی پله‌نزمتان هه‌بـێ تـاکوو پشـتیان پـێ ببه‌سـتن، ئه‌وا ئـێمه‌ش مرۆڤـی پله‌نزممان هه‌یه!» نوکته‌که ئاماده‌بووانی سه‌ر مێزه‌که‌ی خسته قاقای پێکه‌نین و به‌ڕێز پیلکینگتن سه‌باره‌ت به به‌شه‌خۆراکی که‌م و کـاتژمێره دوورودرێژه‌کـانی کـارکردن و نازنه‌کێشـانی ئـاژه‌ڵان که له مه‌زراکه سـه‌رنجی دابـوو، پیرۆزبـایی و ده‌ستخۆشیی له به‌رازه‌کان کرد.

جـا له کۆتاییـدا گـوتی داوا له ئامـاده‌بووان ده‌کـات هه‌سـتنه سـه‌ر پـێ و له‌وه دڵنیـا بـنه‌وه که په‌رداخه‌کانیـان پـڕه. پاشـان به‌ڕێز پیلکینگتن گـوتی: «به‌ڕێـزان، به‌ڕێزان، بـا بخـۆینه‌وه، به خۆشی سه‌رکه‌وتنی مه‌زرای ئاژه‌ڵانه‌وه!»

که‌یفکردن و پێ به زه‌ویداکوتانێکی زۆر له‌ئارادا بوو. ناپلیۆن خۆیشی هێنده سه‌رمه‌ست بووبوو که هه‌ستایه‌وه و به ده‌وری مێـزه‌که‌دا سـووڕایه‌وه تـاکوو به‌ر له‌وه‌ی خـواردنه‌وه‌که‌ی هه‌ڵبقۆڕێنێـت، په‌رداخه‌که‌ی بکێشـێ به‌وه‌ی به‌ڕێـز پیلکینگتنـدا. کاتێک که‌یفکردن و خواردنه‌وه ته‌واو بوو، ناپلیۆن که هێشتا به پێوه وه‌ستابوو، گوتی ده‌یه‌وێ دوو قسه بکات.

وه‌ک هه‌مـوو وتاره‌کـانی، ئه‌مه‌شـیان کـورت و کـاریگه‌ر بـوو. گوتی که ئه‌ویش به هه‌مـان شـێوه، زۆر دڵخـۆش بووه به‌وه‌ی که سه‌رده‌می گومان و دووڵی خه‌ریکه کۆتایی بێت. مـاوه‌یه‌کی دوورودرێـژ ده‌نگـۆی ئه‌وه هه‌بـوو (هه‌ڵـبه‌ت ئه‌م ده‌نگۆیـانه‌ش دروسـت کرابـوون و هۆکـاری خـۆی هه‌بـوو تـاکوو بڵێت که

لەلایەن ژمارەیەک دژمنی چەپەڵەوە بڵاو کرابوونەوە) کە سرووشتێکی یاخیگەرانە لە سیمای خۆی و هاوڕێکانیدا بەدی دەکرێت. گوایە ئێمە لە هەوڵی ئەوەدا بووین ئاگری یاخیبوون لەنێو ئاژەڵانی مەزراکانی دراوسێماندا خۆش بکەین، بەڵام ئەم قسانە تەواو دوورن لە ڕاستییەوە! چونکە لە ئێستە و ڕابردووشدا، تاکە هیوا و ئاواتی ئەوان ئەوە بووە کە ئاشتەواییانە بژین و پەیوەندییەکی ئاسایی بازرگانییان لەگەڵ مەزراکانی دراوسێیاندا هەبێت. هەروەها ئەم مەزرایەش کە شەرەفی بەڕێوەبردنی پێ بڕاوە، کارێکی هەرەوەزی بووە نەک تاکەکەسی. بەڵگەنامەی خاوەندارییەتییەکەش کە لە دەستی خۆیدا بووە، موڵکی هەموو بەرازەکانە نەک تەنیا خۆی.

جا گوتی کە چیدی لەو بڕوایەدا نییە هیچ کۆنەگومانێک مابێتەوە، بەڵام بەو دواییانە چەند گۆڕانکارییەکی دیاریکراو لە شێوازی کاروبارە ڕۆژانەییەکانی مەزراکەدا کراون و بێ گومان دەبێت کاریگەرییەکی یەکاویەک و باشیان لە بەرەوپێشبردن و پتەوکردنی متمانە و بڕوادا هەبێت. تا ئەم ساتەش ئاژەڵەکان خوویەکی گەمژانەیان هەبووە کە ڕەنگە بووبێتە مایەی سەرسامیتان، ئەویش ئەوەیە کە یەکدی بە هەڤاڵ بانگ دەکەن. هاوکات ئەمەشی لێ دەرکەیت، نەریتێکی سەیروسەمەرەتر باوە کە خۆشم نازانم سەرەتاکەی بۆ کەی دەگەڕێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئاژەڵەکان ڕۆژانی یەکشەممە، بە تەک کەللەسەری یەکانەیەکەوە کە بە کۆتەرەیەکی باخچەکەوە بزمارکوت کراوە، مارش دەکەن! ئەمەش هەر مایەی سەرسامییە، چونکە پێشوەختە کەللەسەرەکە کراوە بە

ژێر گڵەوە. بە دڵنیاییەوە ڕەنگە سەردانکەران چاویان بە ئاڵا سەوزەکەش کەوتبێت کە بە دارئاڵاکەوە دەشەکێتەوە و بە ئەگەرێکی زۆر دەکرێت سەرنجی ئەو سم و قۆچە سپییەیان دابێت کە پێشتر بەسەریەوە نەخشێنرابوو، بەڵام ئێستاکە لابراوە. لەمەودوا ئاڵایەکی سەوزی ڕووتوقوت دەبێت و بەس.

ناپلیۆن گوتی تەنیا ڕەخنەیەکی بچووکی لە لێدوانە بەپێز و دۆستانەکەی بەڕێز پیلکینگتن هەیە. «بەڕێز پیلکینگتن بە درێژایی لێدوانەکەی وەک "مەزرای ئاژەڵان" ئاماژەی بە مەزراکەمان کرد، بە دڵنیاییەوە چونکە نەیدەزانی (ناپلیۆن بۆ یەکەمین جار ئێستە هەواڵەکە ڕادەگەیەنێت) ناوی "مەزرای ئاژەڵان" لابراوە. لەمەودوا مەزراکە بە "مەزرای مەینەر" دەناسرێتەوە، چونکە پێم وایە کە ئەمە ناوە ڕاستەقینەکەی خۆیەتی.»

ناپلیۆن بەردەوامیی بە قسەکانی دا: «بەڕێزان، منیش داواتان لێ دەکەم بە خۆشی و سەلامەتیی مەزرای مەینەرەوە بخۆنەوە، بەڵام بە شێوەیەکی جیاواز. پەرداخەکانتان تا لێوار پڕ بکەن. بەڕێزان، دەی با بینۆشین: بە خۆشیی سەرکەوتنی مەزرای مەینەرەوە!»

هەروەک پێشوو هەمان کەیفوسەفا و هەلهەلە دەستی پێ کردەوە و چۆڕیان لە پەرداخەکان بڕی! بەڵام کاتێک ئاژەڵەکانی دەرەوە لە دیمەنەکەیان دەڕوانی، هەستیان دەکرد شتێکی سەیر خەریکە ڕوو دەدات. چ شتێک لە ڕووخساری بەرازەکاندا گۆڕابوو؟ چاوانی لێڵی کزبووی کلۆڤەر خێراخێرا نیگایان لە دەموچاوێکەوە دەگواستەوە سەر یەکێکی تر.

هەندێکیان پێنج چەناگەیان هەبوو، هەندێکیان چوار و هەندێکی تریشیان سێ. بەڵام ئەو شتە چی بوو کە وا گۆڕانکاریی بەسەردا دەهات؟ وەستانەکە کۆتایی هات، ئامادەبووان وەرەقەکانیان هەڵگرتنەوە و دەستیان کردەوە بەو یارییەی کە پێشتر دەستیان لێ هەڵگرتبوو، ئاژەڵەکانیش بێدەنگانە دوورکەوتنەوە.

بەڵام هێشتا بیست یاردێک دوور نەکەوتبوونەوە کە کتوپڕ وەستان. دەنگەدەنگێکی زۆر لە خانووەکەوە دەهات. بە پەلە گەڕانەوە و لە پەنجەرەکەوە دووبارە کەوتنەوە تەماشاکردن. بەڵێ، کەوتبوونە دەمەقرێیەکی دەمارگیرانە. هاواریان دەکرد، بە مێزەکانیاندا دەکێشا، نیگای ڕق و گوماناوییان دەگرتە یەکتری و مکووڕانە بیروڕای یەکدییان ڕەد دەکردەوە. پێدەچوو سەرچاوەی هەموو ئەم بەزمورەزم و کێشەیەش ئەوە بێت کە بەڕێز ویلکینگتن و ناپلیۆن لە هەمان کاتدا وەرەقی بیللی قەرەیان پێبێت.

دوانزە دەنگ بە جارێک دەیاننەڕاند و هەمووشیان وەک یەک بوون. ئێستە ڕوون بوو کە چ گۆڕانکارییەک بەسەر ڕووخساری بەرازەکاندا هاتبوو. ئاژەڵەکانی دەرەوە نیگای چاوانیان لە بەرازێکەوە دەگواستەوە سەر مرۆڤێک و لە مرۆڤێکیشەوە بۆ سەر بەرازێک، بەڵام ئەستەم بوو بزانن کامە بەرازە و کامە مرۆڤ.

تشرینی دووەمی ١٩٤٣- کانوونی دووەمی ١٩٤٤

کۆتایی

### ١- بەڕێز جۆنس

بەڕێز جۆنس كەسایەتیی خراپی ڕۆمانەكەیە، یان باشترە بڵێین دیارترینیانە. بێ گومان ناپلیۆنیش بە هەمان شێوەی جۆنس خراپەكارە و بگرە زۆر لەویش زیاتر، بەڵام بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ. ئۆروێل پێمان دەڵێت ئەو كاتەی كە مەزراكە لە بووژانەوەدا بوو، بەڕێز جۆنس بەرانبەر ئاژەڵەكانی دڵنەرم و باش بوو، بەڵام لە ساڵەكانی دواییدا، دووچاری بارودۆخێكی سەخت بووبووەوە (كە مەبەست لێی سستبوونە ئابوورییە جیهانییەكەی ساڵانی٣٠دا بوو) و لە هەر لایەكەوە تەماشات بكردبا، بارودۆخەكە یاخیبوونێكی دەخواست. ئەم دارمانە ئابوورییەش كە باسمان كرد، لە ئەمریكاوە دەستی پێكرد، ئەو كاتەی لە ساڵی ١٩٢٩دا بازاڕی پارە تووشی شكستێكی گەورە بوو. ئەم قەیرانە هەموو جیهانی گرتەوە، چونكە هەناردەی كاڵای ئەمریكی، تا ڕادەیەكی زۆر پشتی بە ئەوروپا دەبەست. بێ گومان ئەوكات ئەمریكا سەرچاوە و هاوكارێكی باشی بازاڕی ئابووریی جیهان بوو. ئەڵمانیاش هاوشێوەی وڵاتە ئەوروپییەكانی دیكە، گورزێكی باشی ئابووریانەی بەر كەوت. لێكچوون و بەراودكارییەكانی نێوان كەمبوونەوەی دانەوێڵە و شكستە ئابوورییەكی ساڵی ١٩٣٠، تەواو ڕوون و ئاشكرایە. لەو سەردەمەدا تەنیا كاربەدەست و ڕابەر و شوێنكەوتووە ئەڵقەلەگوێكانیان خۆش

دەژیان. بەڕێز جۆنس لێرەدا (هاوکات بۆ نیشاندانی ترسناکیی سیستەمی سەرمایەداری) هێمایە بۆ سیزار نیکۆلاسی دووەم کە پێش ستالین (ناپلیۆن) دەستبەکار بوو. بەم جۆرەش تێدەگەین کە جۆنس نیشاندەری فەرمانڕەوایەتی و حکوومەتی بەر لە ستالین و ساتەوەختی کەوتنی سیزاری دووەمە. ئۆرویل پێمان دەڵێت جۆنس (سیزاری دووەم) بەرەبەرە دەسەڵاتی خۆی لەدەست دەدات، تەنانەت خۆی و پیاوەکانی لە مەیخانەکاندا خوو بە خواردنەوەوە دەگرن. مەیجەری پیر، تێڕوانین و بیروبۆچوونی خۆی سەبارەت بە جۆنس و فەرمانڕەوایەتییەکەی دەردەبڕێت و دەڵێت: «مرۆڤ تاکە بوونەرەوە کە تەنیا بەکار دەبا و هیچ بەرهەم ناهێنێ. لیترێک شیر بەرهەم ناهێنێ، هێلکە ناکا، زۆر لەوە لاوازترە هەوجاڕ ڕابکێشێ و لەوە خاوتریشە کەروێشکێکی پێ بگیرێ. لەگەڵ ئەوەشدا پاشای هەموو گیانداراندە. گشتیان لە بەرژەوەندیی خۆیدا بەکار دەهێنێ و لە بەرانبەریشدا، تەنیا هێندەیان دەداتێ کە لە برساندا نەمرن و پاشماوەکەشی بۆ خۆی هەڵدەگرێ.» بەهەرحاڵ فەرمانڕەوایەتییەکەی جۆنس لەلایەن ئاژەڵەکانەوە هەڵدەوەشێندرێتەوە، بەڵام ئاژەڵەکان بێئاگان لەوەی کە بەرازەکان هەمان مێژوو دووبارە دەکەنەوە.

## ٢- مەیجەری پیر

مەیجەری پیر یەکەم کەسایەتیی نێو ڕۆمانەکەیە کە لەلایەن ئۆروێڵەوە وەسف دەکرێت. مەیجەر چاوڕاستی بەرازەکانە، وەک خوازەیەکە بۆ گەورەفەیلەسووفی گۆڕانکارییەکان؛ کارل

مــاركس. مەیــجەری پیــر پێشــنیاری شــۆڕش دەكــات و ڕێگەچارەیەک بۆ ژیـانی سـەخت و پڕ دەرامەتـی ئاژەڵەكـان لەژێـر فەرمـانرەوایەتیی جۆنسـدا دەدۆزێـتەوە. بە دڵنیـاییەوە ساتەوەختی یـاخیبوونەكە دیـاری نەكـراوە، دەكرێـت ڕۆژێـک دواتر بێت، یاخود دوای چەندان نەوە، بەڵام لێرەدا فەلسـەفەی مەیجەری پیر تاكە پێشنیار و نموونەیەكی بەردەستی باڵایە. سـێ ڕۆژ پاش مردنـی و كاتێک بەرازەكـان دەسـەڵات دەگـرنە دەست، ئەو سۆسیالیزمە ڕێكخراوەی كە پێشنیاری كردبوو، بە تەواوی گۆڕانكاریی بەسـەردا دێت. سـەیر لەوەدایە ئۆرویـڵ بە هـیچ شـێوەیەک لە كـاتی وتـارە گـرنگەكەی مەیـجەری پیـردا، ئامـاژەی بە سنۆوبۆڵ و نـاپلیۆن نەداوە! ئەمەش پێمـان دەڵێت كە ئەم دووانە چەنـدە لە پەیـامی قسـەكانی مەیـجەرەوە دوور بـوون، تەنـانەت دوای ئەوەی دەسـتیان كـرد بە دامەزرانـدنی حكوومەتی نوێ، پێدەچوو قسە و پێشـنیارەكانی مەیـجەر، هیچ بەلایـانەوە گرنـگ نەبن. ڕاسـتییەكەی ئەوە بـوو كە بەرازەكـان لەبری ئەوەی ڕاستگۆ و سەرڕاستانە شـوێن ڕێچكە و پەیامی مەیـجەری پیـر بـكەون، بە تەواوی سـوودیان لە پێشـنیارەكانی بینی و بە شێوەیەكی خراپ لە بەرژەوەندیی خۆیاندا بەكاریـان هێنـــان (ئەمەش ئامـــاژەیە بە بـــادانەوە ســـەرمایەدارییە سەرنجڕاكێشـەكە). ڕەنـگە ئەمە هەوڵێكی ئۆرویـڵ بێت تـاكوو زیـاتر پەردە لەسـەر كەسـایەتیی سـتالین كە زۆرێـک پێیـان وا بـوو بە تەواوی سیاسـەت و تیـۆریی كـۆمەڵایەتیی ماركسـی پشـتگوێ خسـتووە، هەڵماڵێت. بە پشتبەسـتن بە كەسـایەتیی سـاكاری مەیـجەری پیـر، ئۆرویـڵ پێمـان دەڵێـت كە هـیچ كـۆمەڵگەیەكی كامـڵ و بـێخەوش بـوونی نیـیە، هەرگیـز ڕێـی

تێناچێت شارستانییەتێکی کۆمەڵایەتیی بێخەوش بەرهەم بهێنرێت و هیچ ڕێگەیەکیش نییە تاکوو مرۆڤ خۆی لە چرنووکی چەپەڵی سەرمایەداری پێ ڕزگار بکات (ئەم کاریگەرییەش بە شێوەیەکی زەقتر لە کاتی باڵادەستبوونی ناپلیۆندا دەردەکەوێت). بەداخەوە کە هەر ئەوەندەی ناپلیۆن و سکویلەر دەستبەکار دەبن، کاریگەریی مەیجەری پیر زیاد و زیاتر لە مێشکی ئاژەڵەکاندا دەسڕێتەوە.

### ٣- مۆزس

ڕەنگە مۆزس سەرنجڕاکێشترین کەسایەتیی نێو ڕۆمانەکەی ئۆروێڵ بێت. ئەم قەلەڕەشە سەرەتا وەک ئاژەڵی ماڵیی بەڕێز جۆنس ئاماژەی پێ دەردێت، هاوکات تاکە ئاژەڵە کە گوێ بۆ گوتارەکەی مەیجەری پیر سەبارەت بە یاخیبوون ناگرێت و هیچ ئیشێکیش ناکات. ئۆروێڵ دەگێڕێتەوە: «بەرازەکان دووچاری ئاستەنگییەکی قورستر بوونەوە سپیکردنەوە درۆکانی مۆزسی قەلەڕەشی ماڵی. مۆزس، سیخوڕ و قسەبەری بەڕێز جۆنس و بڵاوکەرەوەی پڕوپاگەندە و ئەفسانەی بێمانا بوو، بەڵام قسەزانێکی چاکیش بوو. بە قسەی خۆی دەیگوت گوایە شارێک شک دەبات بە ناوی "کێوی نەبات"، کە هەموو ئاژەڵان دوای مردنیان دەچنە ئەوێ. دەیگوت ئەم کێوە دەکەوێتە ئاسمان، کەمێک لە سەرووی هەورەکانەوەیە، هەر حەوت ڕۆژی هەفتە پشووە و سێپەرە لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا سەوز دەبێت و پەرژینەکانیش کلۆوە شەکر و کێکی تووکەتان دەردەدەن. ئاژەڵەکان ڕقیان لە

مۆزس بوو، چونکە تەنیا چیرۆکی هەڵیتوپەڵیت و ئەفسانەی بڵاو دەکردەوە و دەستی بۆ هیچ ئیشێک نەدەبرد، بەڵام هەندێکیان بڕوایان بە کێوی نەبات هەبوو. لەم نێوەندەشدا بەرازەکان گیریان خواردبوو و دەبوو بکەونە مشتومڕ و چەنەدان، تاکوو بڕوا بە ئاژەڵەکان بهێنن کە وەها شوێنێک بوونی نییە.» مۆزس تێڕوانینی ئۆروێلە بۆ کەنیسە و ئایین. بە بیروبۆچوونی ئۆرویڵ، کەنیسە تەنیا کەرەستەیەکە کە لەلایەن دیکتاتۆرەکانەوە بەکار براوە، تاکوو بەردەوام چینی کرێکاری پێ بخەڵەتێنن، لە کارکردنی بەردەوامدا بیانهێڵێتەوە و هیوای ساختەیان پێ ببەخشێت. ئۆروێڵ مۆزس بەکار دێنێت تاکوو ڕەخنە لە بیروڕاکانی مارکس سەبارەت بە کەنیسە بگرێت، کە باوەڕی وا بوو پاش یاخیبوون، کەنیسە چ ئاسەوارێکی نامێنێت و دەسەڵاتی ناگەڕێتەوە. سەرەتا جۆنس مۆزسی بۆ ئەوەی بەکار دەهێنا تاکوو ئاژەڵەکان لە کارکردن بهێڵێتەوە و بە چەندان ڕێگەی جۆراوجۆریش لەم کارەیدا و پێش یاخیبوون، سەرکەوتوو بوو. بەرازەکان لە دەرکردنی مۆزسدا دووچاری باروودۆخێکی سەخت بوونەوە، چونکە بڕوایان وابوو کە درۆ و چیرۆکەکانی مۆزس تەنیا ئاژەڵەکان لە یەکسانیی کۆمەڵایەتی دوور دەخاتەوە. بەڵام پاش ئەوەی بەرازەکان لەلایەن ناپلیۆنەوە ئاراستە کران و کەم تا زۆر چوونەوە سەر ڕێبازی جۆنس، مۆزسی قەلەڕەش دووبارە ڕێی بۆ خۆش کرا تاکوو بگەڕێتەوە. پاش چەندان ساڵ لە دابڕان، دەگەڕێتەوە و لە پلەوپۆستەکەی خۆیدا دووبارە دەستبەکار دەبێتەوە. بەرازەکان چیدی باکیان بە گەڕانەوەی مۆزس نابێت، چونکە ئاژەڵەکان دەزانن کە ئەو یەکسانییەی

دوای یاخیبوون باسی لێوە دەکرا، تەنیا خەونێکی گاڵتەجاڕانە بوو. هەر بۆیە ناپلیۆن بە ئاوجۆ مۆزس تێر دەکات و بەم جۆرەش هاوکێشەکە تەواو دەکرێت. لەم نێوەندەدا ئۆروێل بیرۆکەیەکی توند و گومانـاویی خۆی بەرانبەر بە کەنیسە ڕوون دەکاتەوە. بەم شێوەیە لامان ڕوون دەبێتەوە کە مەزرای ئاژەڵان بە تەواوی ڕۆمانێکی دژەکۆمۆنیزم نییە، بە جۆرێک کە بەرەو ئایینی مەسیحییەت و سەرمایەداری پاڵ بە خەڵکییەوە بنێت. چونکە ئۆروێل بە باشی دەرکی بە خەوش و ناڕێکییەکانی ئەم دوو سیستەمەش کردووە. سەیر لەوەدایە کە ئێستەش حکوومەتی ڕووسیا ڕێگە بە ئایین دەدات تاکوو دوبارە باڵادەست بێت! پێدەچێت دامودەزگا حیزبییەکانی ئێستەش، وەک بەرازەکانی مەزرای ئاژەڵان، لە هەوڵی ئەوەدا بن کە هاوڵاتیانیان لەو وەهم و خەیاڵەدا بهێڵنەوە، هەڵبەت بە یارمەتیی ئایدۆلۆژیایەکی کۆمۆنیزمیانە نا، بەڵکوو لەڕێی ئەفسانە و ئایدۆلۆژیا کۆنەکانەوە کە وا لە مرۆڤ دەکەن بە ئومێدی ژیان و دونیایەکی دیکەی پاش مەرگەوە بژی.

## ٤- سنۆوبۆڵ

ئۆروێل لە سەرەتادا بە جۆرێک وەسفی سنۆوبۆڵ دەکات، وەک ئەوەی هاوشێوەی ناپلیۆن بێت. ئەم دوو بەرازە پلەوپۆستی ڕابەرایەتییان لە سیستەمی تازەی ئابووری و سیاسیدا دەویست (بێ گومان ئەم بیرۆکەیەش پێچەوانەی یەکسانیی ئاژەڵانە)، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات ئیدی لایان ڕوون دەبێتەوە کە دەبێت یەکێکیان بکەوێت و لە کێبڕکێکە

بچێتە دەرەوە. ئۆرویل پێمان دەڵێت ئەم دووانە هەمیشە مشتومڕیان بوو: «سنۆوبۆڵ و ناپلیۆن چالاکترین ئاژەڵی نێو مەزراکە بوون. بەڵام بووبووە جێی سەرنج کە ئەم دووانە دانوویان پێکەوە ناکوڵێت، هەرکامێکیان بڕیارێکی بدابا، ئەوی دیکەیان لە دژی دەوەستایەوە، بە کورتی ئەم دەیگوت ڕەشە، ئەویان دەیگوت سپییە.» دواتر ئۆروێل گۆمەکە قوڵتر دەکاتەوە و دەڵێت: «ئەم دووانە لە هەر کات و جێ و ڕێیەکدا بۆیان بکرابا، لە دژی یەک دەوەستانەوە.». هەر زوو بابەتی دروستکردنی ئاشەباکە دەبێتە کێشەیەکی گەورە، بە جۆرێک کە ئیدی ناپلیۆن بڕیاری پێویستی دەرکردنی سنۆوبۆڵ دەدات. ڕەنگە خوێنەر پێی وابێت کە ئەمە تەنیا کاردانەوەیەکی دیاری ناپلیۆنە بەرانبەر بە سنۆوبۆڵ، بەڵام گەر وردتر سەرنج بدەین، ئەوا دەبینین کە بابەتەکە بە جۆرێکی دیکەیە. ناپلیۆن بەر لەوەی بکەوێتە دژایەتیکردنی سنۆوبۆڵ، تەختی دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتیی بۆ خۆی دەستنیشان کردبوو. بۆ نموونە تووتکەسەگەکانی لە دایکیان کرد، بۆ ئەوەی یەکە و هێزێکی سەربازی بۆ خۆی پێکەوە بنێت و دواتر بۆ لەناوبردنی ڕکابەرەکەی بەکاریان بهێنێت. لێرەدا سنۆوبۆڵ وەک هێمایەک بۆ ترۆتسکیی ڕکابەری ستالین لە ڕووسیا، دانراوە. خاڵە هاوبەش و لێکچووەکانی نێوان سنۆوبۆڵ و ترۆتسکی، سەیر و بڕواپێنەکراون. ترۆتسکی بە هەمان شێوە دەرکرابوو، بەڵام لە مەزرایەک نا، بەڵکوو لە ڕووسیاوە بۆ مەکسیک، کە لەوێ وتاری دژ بە ستالین دەدا. ستالین زۆر لە ترۆتسکی دەترسا، دەترسا لەلایەن شوێنکەوتووانی ترۆتسکییەوە بکوژرێت. بەم جۆرە دیکتاتۆرەکەی ڕووسیا، هەموو هەوڵێکی خۆی خستە

گەڕ تاکوو ترۆتسکی بکوژێت، چونکە خەیاڵی مانەوە لەسەر دەسەڵات، خراپ لەنێو کەللەی پیاوێکی دەمارگیر و شێتی وادا ڕەگی داکوتابوو. ترۆتسکیش وەک ستالین، بڕوای بە کۆمۆنیزم هەبوو، بەڵام پێی وابوو کە دەتوانێت ڕووسیا باشتر بەڕێوە ببات. دواجار ترۆتسکی لەلایەن هێزی ناوخۆی ڕووسیاوە «NKVD» کە ڕێکخراوێکی سەرەتایی«KGB» بوو لە مەکسیک کوژرا. پاچێک لە سەری درابوو و لاشەکەی لە ڤێلایەکدا دۆزرایەوە.

### ٥- ناپلیۆن

ناپلیۆن کەسایەتیيە بەدکار و خراپەکەی مەزرای ئاژەڵانە. ناوی ناپلیۆن زۆر بە هەڵکەوت دانراوە، لە کاتێکدا دیکتاتۆرەکەی فەرەنسا (ناپلیۆن) لەلایەن زۆر کەسەوە وەک دژەمەسیح (دەجال) ناوزەد دەکرا. ناپلیۆنی بەراز، کەسایەتیی سەرەکی ناو مەزراکەیە. وەک هێمایەک بۆ ستالین دانراوە و نیشاندەری خاڵە لاوازەکانی مرۆڤە لە هەموو شۆڕشەکاندا. ئۆروێڵ باوەڕی وا بوو کە هەرچەند سۆسیالیزم سیستەم و بەرنامەیەکی باش بێت، بەڵام هەرگیز بە بۆنەی خووە سرووشتییە خراپە چڵەونەگیراوەکانی مرۆڤەوە ناچەسپێت. بۆ نموونە سەرەتا ناپلیۆن ڕابەرێکی باش دیار بوو، بەڵام دواجار و بە تێپەڕبوونی کات، ڕق و تینوویەتی بۆ دەسەڵات، بەرچاوی تاریک کرد. بێ گومان ستالینیش هەمان کاری کرد، هەموو بنەما و ئاکارە باشەکانی سۆسیالیزمی لە دوای خۆیەوە بەجێ هێشتن و گشت دەسەڵات و خۆشگوزەرانییەکی

بۆ خۆی فەراهەم کرد، لە کاتێکدا چینی جووتیاران ئازار و مەینەتییان دەچەشت. ئیدی لەو ماوەیەدا کە هەموو دەسەلاتێکی نەتەوەیی و نێودەوڵەتیی هەبوو، ڕەوشی ڕووسیا وەک خۆی مایەوە و هیچ گۆڕانکارییەکی بە خۆیەوە نەبینی. ئۆرویڵ پێمان دەڵێت: «بە جۆرێک لە جۆرەکان مەزراکە تا دەهات دەوڵەمەندتر دەبوو، بەڵام ئاژەڵەکان لەگەڵیدا دەوڵەمەند نەدەبوون و هەروەک خۆیان مابوونەوە، هەڵبەت بێجگە لە بەراز و سەگەکان.» بەڵام ڕووی ڕاستەقینەی ناپلیۆن ئەو کاتە دەردەکەوێت کە ژمارەیەکی زۆری ئەو ئاژەڵانە دەکوژێت کە پلانیان لە دژ گێڕابوو. تەنانەت بەرازێکیش بە تایبەت ڕادەسپێرێت تاکوو خۆراکەکەی بپشکنێت، نەبادا ژەهراوی کرابێت. ستالینیش بە هەمان شێوە دیکتاتۆرێکی دڵڕەق بوو. پاش ئەوەی لە ئیمپراتۆرییەتەکەی خۆیدا گومانی لە چەند کەسێک کرد کە هاوپەیمان ؤ یارمەتیدەری ترۆتسکی (سنۆوبۆڵ)بن، بێ چەندوچۆن زۆربەی هەرە زۆریانی کوشتن. لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا پێناچێت ناپلیۆن دەوڵەتێکی سۆسیالیست بەڕێوە بەرێت. پاش گۆڕینی ناوەکەی بە کۆمار و دانانەوەی یاسا و سروودی ئاژەڵانی ئینگلتەرای تایبەت بە خۆی، ناپلیۆن کەم تا زۆر دەبێتە ئەو دیکتاتۆرەی کە بە دڵنیاییەوە هەرگیز لەلایەن ئاژەڵانەوە هەڵنەبژێردرابوو.

### ٦- بۆکسەر

ناوی بۆکسەر، زۆر زیرەکانە وەک خوازەیەکی یاخیبوونی بۆکسەری سەرەتاکانی سەدەی بیستی چین، لەلایەن

ئۆروێڵەوە دانراوە. ڕاستییەکەی هەر ئەم یاخیبوونەش بوو کە ڕەگوڕیشـەی کۆمـۆنیزمی لە چینـی سـووردا دامەزرانـد. ئەم کۆمۆنیزمە، هاوشێوەی بیرۆکە شێواوەکەی ستالین سـەبارەت بە سۆسـیالیزم، تـاکوو ئێسـتەش لە حکـوومەتە سۆسـیالە سـتەمکارەکانی چینـدا ئامـادەگیی هەیە. بۆکسـەر و کلـۆڤەر لەلایەن ئۆروێڵەوە وەک هێمایەک بۆ چینی پڕۆلیتار یاخود ئەو چینە بێبەهـرە و نەشـارەزا ڕەنجدەرە دانـراون کە ئەوکـات لە ڕووسیادا هەبوو. ئەم چینە نزمەش بە تەواوی ملی بۆ سـتالین دابـوو، چـونکە پێیـان وا بـوو کە قـازانجێکی زیاتریـان لەم سیستەمە تازەیەوە دەست دەکەوێت. لە بارێکدا کە بۆکسـەر و ئـاژەڵە پلەنزمەکـانی هاوشـێوەی هەرگیـز ئەزمـوونی خۆشگوزەرانییان نەکردبوو، نەیاندەتوانی ژیانی ئێستەی ژێر فەرمانڕەوایەتیی ناپلیۆن بەو ژیانە بەراورد بکەن کە پێشتر لە سـەردەمی سـیزار (جـۆنس)دا هەیـانبوو. جـگە لەمەش، بە پشتبەستن بەوەی کە نزمترین چین، کەمترین ئەقڵیشـی هەیە، خەڵەتانـدن و فریودانیـان بەوەی کە لە بـارودۆخێکی باشـدان، کارێکی هێندە قورس نییە. هاوکات چینی پڕۆلیتار زۆر بـاش یەکـدی دەهێنـنە ژێـر ئەو ڕایەی کە کۆمـۆنیزم، بەرنـامە و پلانێکی باشە. ئۆروێڵ ئەم بیرۆکەیەی پشتڕاست دەکاتەوە و دەڵێـت: «هەردوو ئەسـپی عەرەبـانەکە، بۆکسـەر و کلـۆڤەر، گوێڕایەڵترین و دڵسۆزترین شوێنکەوتووی بەرازەکان بـوون. ئەم دووانە بێ لەوەی بەرازەکان وەک مامۆستا و سەرمەشقی خۆیان سەیر بکەن، مێشکیان بۆ هیچ شتێکی دیکە نەدەچوو. هەموو قسە و لێدوانەکانیان لێ وەدەگرتن و بە زمانێکی سادە، لە ئاژەڵەکانی دیکەیـان دەگەیانـدن.» دواتـر و کاتێـک بۆکسـەر

بەردەبێتەوە و ڕێژەی بەرهەمهێنان و کارکردن بە شێوەیەکی بەرچاو کەم دەبێتەوە، گرنگیی چینی پرۆلیتار دەردەکەوێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بەرازەکان لەبەرانبەر بڕێک پارەدا دەستبەرداری دەبن و لە عەرەبانەیەکی کەتیرەدروستکردندا دەیگوازنەوە. لەم ڕۆمانەدا بۆکسەر دیارترین هێمای کۆیلایەتی و ملکەچیی چینی هەژارانە.

## ٧- سکویڵەر

سکویڵەر کەسایەتییەکی جێسەرنجی مەزرای ئاژەڵانە. سەرەتا وەک گوتاربێژ و دەمڕاست باسی لێوە دەکرێت. ئۆرویل پێمان دەڵێت: «دەیتوانی ڕەش بە سپی بنوێنێت!» زۆربەی هەرە زۆری ڕەخنەکان، سکویڵەر بە *پراڤدا*وە گری دەدەن، کە ڕۆژنامەیەکی ڕووسی بووە و لە ساڵانی ١٩٣٠دا دەردەچوو. سەرچاوەی زۆرێک لە بڵاوکراوەکان بوو، جا بە بۆنەی ئەوەی کە هیچ ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنێک لەو سەردەمەدا نەبوو، ڕۆژنامە سەرچاوەی سەرەکیی زانیارییەکانی میدیا بوو. قۆرخکارییەکانی پراڤدا، لەلایەن ڕژێمە شیوعییە نوێکەی ستالینەوە جڵەوی گیرا. لە مەزرای ئاژەڵاندا، سکویڵەر ڕۆڵی ڕۆژنامە و میدیا دەبینێت و ڕایەڵێکی لەنێوان ناپلیۆن و ئاژەڵەکانی دیکەدا دروست کردووە. هەر بۆیە کاتێک سکویڵەر پەردە بەسەر نیاز و بەرنامەیەکی خراپدا دەدات، ئەوا دەکرێت نیازی خراپی کۆمۆنیستەکان بێ هیچ دژایەتی و کێشەیەک، ئازادانە دەرببڕێت. هاوکات هەندێک پێیان وایە کە سکویڵەر هێمایەکە بۆ گۆبێڵز کە شالیاری بانگەشەی ئەڵمانیا بوو. بەڵام

ئەمەیــان لەگەڵ نــاوەڕۆکی ڕۆمــانەکەی ئۆروێڵــدا نــایەتەوە، چونکە بە هەموو شێوەیەک چاوەڕوانیی ئەوە لە ئۆروێڵ دەکرا کە خوازەی کەسایەتییەکی ڕووسی دابنێت.

## ٨- مۆڵی

مۆڵی کەسایەتییەکی لاوەکیی ڕۆمانەکەیە، بەڵام نوێنەرایەتیی شــتێکی زۆر گرنــگ دەکــات. مــۆڵی ئەو ئــاژەڵەیە کە تــا سەرئێسقان دژی حکـوومەتە نـوێکەی نـاپلیۆنە. زۆر بـاکی بە سیاسەت و ڕەوشی مەزراکە نییە، تەنیا دەیەوێت یاڵەکانی بە قـــردێلە بـــڕازێنێتەوە و کڵۆەشـــــەکر بخـــوات و پـــێگە کۆمەڵایەتییەکەشــی ڕێــگەی نــادات. زۆربەی ئاژەڵەکــان کە دەیــانبینی خــاوەنمەزرا دراوســێکانی دەســت بە قەپۆزیــدا دەهێنن، بە ناپاک لە قەڵەمیان دەدا. دواتر هێندە نابات لەلایەن ئــاژەڵە جــددییەکانی مەزراوە بەرپەرچ دەدرێــتەوە و ئەویــش ناچـار سـەری خـۆی هەڵدەگرێت. مـۆڵی هێمـایە بـۆ ئەو چینە ناوەنـدییە لێهـاتوو و ئـاقڵەی کرێکـاران کە بەدەست بیـرۆکە و بنەما تازەکانی کۆمۆنیزمەوە دەیانناڵاند. چیدی هـیچ شـەکرێکی دەست نەدەکەوت تاکوو بیخوات، چونکە ئێستە لەئاست ئاژەڵە پلەنزمەکانی دیکەدا بوو و هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ بۆکسـەر و کلۆڤەردا نەبوو. ئۆروێڵ لەڕێی مۆڵییەوە ئەو چینەمـان نیشـان دەدات کە تاکەکانی ئامادە نین بێنە ژێر بـاری ئەو حکـوومڕانی و یاســا ئابووریــانەی کە بەســەریاندا دەســەپێندرێن. ئەمەش تێڕوانینـی ئۆروێڵمـان بـۆ شـی دەکـاتەوە کە ڕقـی لەوە بـووە هەمــوو ئاژەڵەکــان لە یەک ئاســتدا دابنێــت. هاوکــات فکــری

ماركسيزم، ڕەخنەی ئەوە لە سۆسیالیزم دەگرێت کە سیستەم و بەرنامەیەکی بێخەوش نییە و لەگەڵ پێداویستیی هەمووان‌دا نایەتەوە.

### ٩- بنجامین

بنجامینی پیر، گوێدرێژێکی بەساڵاچووە و لەم ڕۆمانەدا یەکێکە لە سەیرترین کەسایەتییەکانی ئۆروێڵ. بەوە وەسف دەکرێت کە لەدوای یاخیبوونەکەوە هیچ نەگۆڕاوە. هەر وەک جاران کاری خۆی دەکات و سەبارەت بەو شتانەش کە ڕوو دەدەن، نە زۆر خۆشحاڵ دەبێت، نە نائومێدیش. بنجامین دەڵێ: «گوێدرێژەکان تەمەنێکی درێژ دەژین، هیچ یەک لە ئێوە بە تەمەنتان مەرگی گوێدرێژێکتان نەبینیوە.» هاوکات هیچ نزیکبوونەوە و پەیوەندییەکی خوازەیی لەنێوان بنجامین و ڕەخنەکانی ئۆروێڵ سەبارەت بە کۆمۆنیزم نییە، بەڵام ڕێی تێدەچێت گەر بڵێین ئەوانەی لە کاتی شۆڕشەکاندا خەم و ڕۆڵێکی گرنگیان نەبوو، ئەوا پاش شۆڕشیش وەک ئەوانی دیکە چاویان لە دەستی ڕابەرەکانیان نەبوو. بنجامین هێمایەکە بۆ ئەو ڕەخنانەی کە ئاراستەی یاخیبوون و شۆڕشە کۆن و تازەکان دەکران. ڕاستییەکەی پێدەچێت بنجامینی پیر تاکە ئاژەڵ بێت کە باکی بە مەزرای ئاژەڵان و دەسەڵاتە نوێکەی ناپلیۆن نەبێت. وەک بڵێیت داهاتووی بینیبێت و سوور بزانێت کە یاخیبوونەکە تەنیا گۆڕانکارییەکی کاتییە و دواجار پێچەوانە دەبێتەوە. هاوکات بنجامین تاکە ئاژەڵی مەزراکەیە کە هیچ پێشبینییەکی باش و ئەرێنیی سەبارەت بە شۆڕشەکە نییە.

بەراود بە ئاژەڵەکانی دیکە، پێدەچێت لە قۆناغ و ئەزموونێکی ژیانی تەواو جیاوازدا بێت. وەک ئاژەڵەکانی دیکە فریوی بانگەشەکانی ناپلیۆن ناخوات. تەنیا لە یەک کاتدا باکی بە ئاژەڵەکانی دیکە دەبێت، ئەویش ئەو کاتەی کە بۆکسەر بە عەرەبانەکە دەبەن. چونکە لەو کاتەدا هەوڵ دەدات ئاژەڵەکانی دیکە لە چارەنووسی بۆکسەر ئاگادار بکاتەوە و وا دیارە لە قاوغ و کەسایەتیی متبوو و جددیی خۆی هاتووەتە دەرەوە. ئاژەڵەکان هەوڵی ڕزگارکردنی بۆکسەر دەدەن، بەڵام تازە زۆر درەنگە و فریای ناکەون. لە کۆتاییدا وا دەردەکەوێت کە بنجامین لە دژی ناپلیۆن وەستابێتەوە و هەموو هەوڵ و زیرەکییەکی خۆی بۆ دەرخستنی تەڵەکەبازیی بەرازەکان خستبێتە گەڕ. پاش ئەوەی ئاژەڵەکان سەردەمی جۆنس و ڕەوشی ژیانی ڕابردوویان لە بیر دەکەن، بنجامین هێشتاش هەموو وردەکارییەکانی لە یاد دەبێت. ئۆروێل پێمان دەڵێت: «تەنیا بنجامینی پیر بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە هەموو وردەکارییەکانی ژیانی دوورودرێژی خۆی لە یادە و دەزانێت کە شتەکان نە خراپتر بوون و نە باشتر و نە دەشکرا باشتر یان خراپتر ببن! دەیگوت کە برسییەتی و کاری قورس و نائومێدی بەشێکن لە یاسای نەگۆڕی ژیان.»

### ١٠- موریڵ

موریڵ ئەو بزنە زیرەک و خوێندەوارەیە کە یاساکان بۆ کلۆڤەر دەخوێنێتەوە. موریڵ هێمایە بۆ کەمینەیەکی چینی کرێکاران، ئەوانەی کە بەشی ئەوە وشیارییان هەیە تاکوو

بریـار لەسـەر ژیـانی خۆیـان بـدەن و ڕیاکـاری و گەنـدەڵیی ڕابەرەکانیان بخەنە ڕوو. بەڵام بەداخەوە بۆ ئاژەڵەکانی دیکە، موریڵ هێندە بەهرەدار و کەسایەتییەکی کاریزمی نییە تاکوو بە چالاکی و هەنگاوی خۆی هەستێت و لە دژی ناپلیۆن و بەرازەکانی دیکە بوەستێتەوە.

## ١١- بەرازەکان

ئۆرویڵ بەرازەکان وەک دەستوپێوەند و هاوکارانی ناپلیۆن بەکار دەهێنێت. ئەم بەرازانە هێمان بۆ هاوڕێ و حیزبە کۆمۆنیستە وەفادارەکانی ستالین. بەرازەکان بە پێچەوانەی ئاژەڵەکانی دیکەوە، ژیانێکی خۆشیان هەیە و بەسەر سوود و قووتی ئەو کۆمەڵگەیەوە دەژین کە لە هەوڵی ئەوەدان بە تەواوی دەستی بەسەردا بگرن. لێرەدا ناداپەروەری و ڕیاکاریی ڕاستەقینەی کۆمۆنیزم خراوەتە ڕوو، هاوکات ئەمە ڕەخنەیەکە لە دژی بیروڕا سادە و ساکارەکانی کارڵ مارکس، بۆ کۆمەڵگە یۆتۆپیاییەکەی سۆسیالیستەکان. بێ گومان جۆرج ئۆرویڵ بڕوای بە هەبوونی وەها کۆمەڵگەیەک نییە و لە دوابەدوای کۆتاییهاتنی ڕۆمانەکەدا دەڵێت: «مەزراکە بە جۆرێک لە جۆرەکان تا دەهات دەوڵەمەندتر دەبوو، بەڵام ئاژەڵەکان لەگەڵیدا دەوڵەمەند نەدەبوون و هەروەک خۆیان مابوونەوە، هەڵبەت بێجگە لە بەراز و سەگەکان.»

## ١٢– سەگەکان

ئۆروێـڵ سـەگەکانی وەک هێمـایەک بـۆ«KGB» و هێـزە سـەربازییە تایبەتەکـانی دیـکە دانـاوە، کە لە هەوڵـی پاراسـتنی دەسـتکەوتەکانی حیـزب و لایەنێکـی دیـاریکراودان، یـاخود گەر وردتـر لێـی بڕوانین، پاسـەوانە تایبەتەکـانی ستالین. سـەگەکان پـارێزەری نـاپلیۆن و بەرازەکـانن، هـیچ قسـەیەک نـاکەن و هێزێکن کە بە هەر جۆرێک بووە، پێویستە ئاژەڵەکان خۆیانیان لەگەڵ بگونجێنن. ئۆروێڵ بە جۆرێک باس لە سەگەکان دەکات وەک ئەوەی ڕۆبۆتێکی بێمێشک بن، هێندە وابەسـتەی ناپلیۆنن کە خۆیـان نـاتوانن بیروڕا و قسـەیەکیان هەبێت! ئەم بـابەتەش لەو کـاتەدا دێـتە ئـارا کە ئۆروێـڵ بـاس لە گواسـتنەوە گومانـاوییەکەی توولەسـەگەکان دەکات لەلایەن نـاپلیۆنەوە. بۆ مـاوەیەک خـوێنەر هەروا بێ هـیچ سـەرەدوایێک لە چاوەڕوانیدا دەهێڵـرێتەوە، بەلام دواتـر کاتێـک ئۆروێـڵ باسـی ڕاوەدوونـانەکەی سـنۆوبۆڵ و دەرکەوتنـی سـەگەکان دەکـات، بەرچـاوڕوونییەکی پـێ دەدرێـت. نـاپلیۆن بـۆ یەکەم جـار «پاسـەوانە نهێنـی»یەکـانی خـۆی ئاراسـتە دەکـات، بەر لەوەی سـنۆوبۆڵ بـواری ئەوەی هەبێـت هەسـتێتەوە و بەرپەرچـی دژایەتیکـردنەکەی نـاپلیۆن لەمەڕ ئاشـەباکە بداتەوە، سـەگەکان بێبەزەییانە پەلاماری دەدەن و سنۆوبۆڵ ناچار ڕادەکات و بۆ ئەبەد نـاگەڕێتەوە. ئۆروێـڵ پێمـان دەڵێـت: «سـەرەتا کەس نەیـدەزانی ئەم بـوونەوەرانە لە کوێـوە سـەریان دەرهێنـا، تـا نـاپلیۆن مەتەڵەکەی بـۆ هەڵهێنـان. ئەمـانە هەمـان ئەو توتکەسـەگانە بـوون کە نـاپلیۆن لە دایکیـانی بڕین و دوور لە هەمووان و بە دزییەوە، بەخێوی کردن. لەگەڵ ئەوەشدا کە بە

تەواوی گەورە نەبووبوون، کەچی زۆر کەتە و زەبەلاح دیار بوون و نیگایەکی دڕ و سامناکی چەشنی گورکیان هەبوو. هەمیشە لە نزیک ناپلیۆنەوە دەمانەوە. سەرنج درا وەک چۆن سەگەکانی دیکە کلکەلەقێیان بۆ بەڕێز جۆنس دەکرد، ئەمانیش بە هەمان شێوە بۆ ناپلیۆنی دەکەن.» بەکارهێنانی سەگەکان، دۆخێکی شەڕەنگێزانەی لێ دەکەوێتەوە و دواجار یارمەتیدەری ناپلیۆن دەبێت تاکوو بە تەواوی دەسەلات بگرێتە دەست. دواتر سەگەکان کاری دزێو و قێزەونتر دەکەن، کاتێک فەرمانیان پێ دەکرێت هەموو ئەو ئاژەلانە بکوژن کە بێگوێیی ناپلیۆنیان کردووە. ستالینیش بە هەمان شێوە هێزێکی چەکداری تایبەتی هەبوو. بێ گومان ڕوونە کە هەموو سیاسی و سەرکردەیەک بەشی خۆی شوێنکەوتووی هەیە، بەلام ستالین زۆر پێویستی بە هێزێکی تایبەت بوو، تاکوو لەڕێیەوە دژمنەکانی لەناو ببات. ڕێک بەم جۆرە و لەڕێی ئەم هێزانەوە، ترۆتسکیش کوژرا.

## ١٣- ئاژەڵەکان

ئاژەڵگەلی دیکەی مەزراکە تا ڕادەیەک لە بۆکسەر و کلۆڤەر دەچن. مەڕەکان و ئەسپەکان لە هەر لایەکەوە سەیریان بکەیت نیشاندەری چینی پڕۆلیتار و کرێکارانی بێەزموونی زەحمەتکێشن. ئەم ئاژەلانە لە کارکردندا پشتیان بە جەستە و هێزی شان قایمە نەک ئەقڵ. هەر لەبەر ئەم هۆکارەشە کە نزمترین چینی کۆمەڵگەن و بەردەوام لەلایەن سیاسەتمەدارانەوە بەکار دەبرێن و مێشکیان دەشۆردرێتەوە.

سرووشــــتی ئەم ئــــاژەڵانە وایە کە زوو تەفــــرە دەدرێـــن و دەبەنگـــن. ئۆروێـــڵ بەردەوام پـــاتەی دەکـــاتەوە کە ئەگەر باعەبـاعی مەڕەکـان (دووپێکـان خـراپن، چوارپێکـان باشـن) نەبــووایە، کە لەلایەن بەرازەکــانەوە ئاراســتە کرابــوون تــا بیڵێنەوە، نـاپلیۆن هەرگیـز ئەو دەسـەڵات و جڵەوگیـرییەی بـۆ نەدەڕەخسـا کە دواتـر بـۆ چەوسـاندنەوەی ئاژەڵەکـان بەکـاری هێنا.

## ١٤- فریدریک

نەریتــــی تەقانــــدنی تفەنــــگ و هەڵکردنــــی ئــــاڵا لەلایەن ئاژەڵەکـانەوە و لە سـەردەمی حکـوومڕانیی ناپلیۆنـدا، لەڕێـی وەسفەکانی ئۆروێڵەوە بۆ فریدریکی دراوسێی مەزرای ئاژەڵان هاتنە ئارا. فریدریک بە درێژایی چیرۆکەکە چەندان جار دەبێتە دۆسـت و دژمنـی نـاپلیۆن، سـەرەتا دژمنیەتـی، دواتـر دەبێتە دۆست و هەمدیس دەبێتەوە دژمنی و لەو نێوەندەشدا، چەندان ڕێککەوتنـی نهێنـی و تەڵەکەبـازانە لەگەڵ ناپلیۆنـدا دەبەسـتێت. یەکێـک لە کێشـە سـەرەکییەکانی مەزراکە، کێشـەی دارەکـانە. نـاپلیۆن دارەکـان بە فریـدریک دەفرۆشـێت، تـا دواتـر بـۆی دەردەکەوێـــت کە پارەکـــان ســـاختەن و هەڵخەڵەتێنـــراوە. ســـەروەختی قەیـــران و سســـتبوونە ئـــابووریـیە جیهـــانییەکە، وڵاتەکـان ناچـار بـوون تـاکوو پردی بازرگـانی لەگەڵ یەکدیـدا دروست بکەن. وڵاتێک شتێکی بەرهەم دەهێنا یاخود سامانێکی سرووشـتیی هەبـوو کە وڵاتەکـانی دیـکە نەیـانبوو، هەر بـۆیە لەپێنـــاو مـــانەوەدا، ئەو وڵاتەی کە نەیبـــوو، ناچـــار بە

بازرگانیکردن دەبوو. زۆر جاریش ڕێککەوتنەکان ساختە و نادادپەروەرانە بوون و ئەمەش کێشەی نێودەوڵەتیی زۆری هێنایە ئارا. بەم جۆرەش لێکچوونەکانی مەزرای ئاژەڵان و ڕووداوە مێژووییەکان بە ڕوونی دەبینن.

**١٥- پیلکینگتن**

پیلکینگتن دراوسێیەکی دیکەی مەزرای ئاژەڵانە، ئۆروێل وەک هێمایەک بۆ هێزە هاوپەیمانەکانی جەنگی جیهانیی دووەم دایناوە (بێ گومان بە ڕووسیاشەوە). دروست وەک یەکێتیی سۆڤییەتی پێش جەنگی جیهانیی دووەم، مەزرای ئاژەڵانیش نەیدەزانی کە دۆست و هاوپەیمانانی کێ دەبن. بەڵام دوای لەدەستدانی متمانە و پەیوەندی لەگەڵ فریدریکدا (ئەڵمانیا)، ناپلیۆن (ستالین) بڕیار دەدات لە پیلکینگتن نزیک ببێتەوە و بیکاتە هاوپەیمانی خۆی. ناپلیۆن و بەرازەکانی دیکە هەر بەمەوە ناوەستنەوە، بەڵکوو لە کۆتایی کتێبەکەدا و بۆ ئێوارەخوانێک، پیلکینگتن بانگهێشتی مەزراکە دەکەن. لێرەدا پیلکینگتن و پیاوەکانی سەبارەت بە چالاکی و بەرەوپێشچوونی مەزراکە، پیرۆزبایی لە ناپلیۆن دەکەن. ئۆروێل دەڵێت: «بەڕێز پیلکینگتن سەبارەت بە بەشەخۆراکی کەم و کاتژمێرە دوور و درێژەکانی کارکردن و نازنەکێشانی ئاژەڵان کە لە مەزراکەدا سەرنجی دابوو، پیرۆزبایی و دەستخۆشیی لە بەرازەکان کرد.» ڕێک بە هەمان شێوەش، پاش تەواوبوونی جەنگی جیهانی، هاوپەیمانانی ڕووسیا، دانیان بە بەرەوپێشچوونەکانی ڕووسیادا نا. بەڵام هێندەی نەبرد شەڕی سارد لەنێوان ڕووسیا و ئەمریکادا هەڵگیرسا. هەڵبەت ئەم ڕووداوەش بە شێوەیەکی تەواو سەیر و چاوەڕواننەکراو لە کتێبەکەدا، کە لە

ساڵی ١٩٤٦دا نووسراوە، ئاماژەی پێ کراوە کاتێک ئۆروێڵ دەڵێت: «دەنگەدەنگێکی زۆر لە خانووەکەوە دەهات. بە پەلە گەڕانەوە و لە پەنجەرەکەوە دووبارە کەوتنەوە تەماشاکردن. بەڵێ، کەوتبوونە دەمەقرێیەکی دەمارگیرانەوە. هاواریان دەکرد، بە مێزەکانیاندا دەکێشا، نیگای ڕق و گوماناویان دەگرتە یەکتری و مکووڕانە بیروڕای یەکدییان ڕەد دەکردەوە.» بە شێوەیەکی سەیر و تەواو ژیرانە، ئۆروێڵ هەستی بە گرژییەکانی نێوان ئەمریکا و ڕووسیا کردبوو کە ساڵانێک بوو لە نێوانیاندا پەنگی خواردبووەوە.

### ١٦- جرجەکان

جرجەکان و ئاژەڵە کێوییەکانی دیکەی وەک کەروێشک، ئاماژەن بە حیزبە بەرهەڵستکارەکانی شیوعییەت. ئەوانیش دەبوو لە یاخیبوونەکەدا بەشدار بن و تا ماوەیەکی زۆریش هەر هاوپەیمانی حکمووڕانییەکەی دیکە بوون. لێرەدا جرج و کەروێشکەکان، ئاماژەن بە حیزبە سیاسییەکانی دەسەڵاتی ئەو سەردەمە. چونکە ئەگەر حیزبی کۆمۆنیست پەیوەندیی لەگەڵ لینین بپچڕاندبا، ئەوا هەر حیزبی دیکە هەبوون تاکوو پەیوەندییان لەگەڵدا خۆش بکات. ئەمانە ئاژەڵی بێباک و کێوی بوون.

### ١٧- کۆترەکان

کۆترەکان هێمای بانگەشە (پرۆپاگەندە)ی ڕووسین، بێ گومان بانگەشە لەنێو خودی ڕووسیادا نا، بەڵکوو هەواڵەکانیان بە وڵاتانی دەرەوەی وەک ئەڵمانیا و فەرەنسا و ئینگلتەرا و تەنانەت ئەمریکاشدا بڵاو دەکردنەوە. ڕووسیا

تەنـــانەت پـێش جەنگـــی جیهـــانیی دووەمـــیش، بەربەســـت و دیوارێکی ئاسنی بۆ خۆی دروست کردبوو. لەو ســەردەمەدا حکوومەتی کۆمۆنیست، هەواڵی دەستکەوت و بەرەوپێشچوون و ئامێرە تەکنەلۆژییە پێشکەوتووەکانی خۆی بڵاو دەکردەوە، بەڵام هەرگیــز ڕێــگەی نەدەدا، کەســێکی زانــا و شــارەزا لە وڵاتێکی دیکەوە بێت و چاویان لێ بکات. ئۆروێڵ پێمان دەڵێت کە خاوەن مەزراکانی دراوسێی مەزرای ئاژەڵان، تەواو دوودڵ و بەدگومــان بووبـوون کاتێـک ئاژەڵەکانیـان دەکەوتـنە چرینـی ســروودی (ئــاژەڵانی ئینگلــتەرا). زۆربەی زۆری حکــوومەتە خۆرئاواییەکانی ئەم سەدەیەش، لەگەڵ خەڵکەکانیاندا، بەدەست هەمـــان کێشـــەوە ناڵانـــدوویانە. چـــونکە لە ســـەدەی بیســـتدا، لێشاوێکی بەرفراوانی (ترسـی سـوور) لە ئەمریکادا هەبوو. لە دەوروبەری ساڵانی١٩٥٠دا، جۆزێف میککارسی، کە ئەندامێکی یاســادانەرانی حکـوومەتی ئەمریکـی بـوو لە ویسکۆنســن، لەو مـاوەیەدا ســەدان کەسـی بە تـۆمەتی پشـتگیریکردنی ڕژێمـی فاشیست تاوانبـار کـرد، ئیدی هەر لە ئەکتەرە بەناوبانگەکـانی هۆلیـوودەوە بیگـرە تـا خەڵکـانێکی ئاسـایی چـینمامناوەنـدی کـۆمەڵگە. ترســـی کۆمــۆنیزم لە ئەمریکـــادا وەک فۆبیـــایەکی لێهـاتبوو، هەر کەسـیش دژی حکـوومەت لێدوانێکی بـدابا، ئەوا دەبووە گومانلێکراو.

سەرچاوە:

www.academia.edu

# ANIMAL FARM

## GEORGE ORWELL

مەزرای ئاژەڵان، شاكارێک كە پێویستە هەموو تاكێک پێی ئاشنا بێت. ڕۆمانی مەزرای ئاژەڵان، بە خامەی نووسەری بەناوبانگ «جۆرج ئۆروێڵ» نووسراوە. بیرۆكەی ڕۆمانەكە، وەک زۆربەی زۆری كتێبەكانی دیكەی نووسەر، بە دەوری ڕەخنەی سیاسیدا دەسووڕێتەوە، هاوكات دەكرێت وەک دەروازەیەک بۆ ئاشنابوون بە دونیای تەمومژاویی سیاسەت سەیر بكرێت. نووسەر لەم ڕۆمانەدا بە گشتی ڕەخنەیەكی ورد لە شۆڕش و بە تایبەتیش شۆڕشی ڕووسیی ساڵی 1917 و بەرئەنجامەكانی دەگرێت، پیمان دەڵێت ڕەنگە شۆڕش گۆڕانكاری لە سیستەمی سیاسیدا دروست بكات، بەڵام دەكرێت ئەم گۆڕانكاریانە خراپ بن، نەک باش! ڕۆمانەكە هەڵگری پەیامێكی گرنگە، چ بۆ سەردەمی خۆی، چ بۆ ئێستەش، چونكە تاک هۆشیار دەكاتەوە لەوەی كە هەمیشە لەلایەن سیستەمە سیاسییە جیاوازەكانەوە، لە بەردەم مەترسیی تەفرەداندایە. كێ چووزانێ؟ ڕەنگە ئەگەر بە باشی لەم ڕۆمانە تێبگەیشتباین، ئەوا هەرگیز كارمان بەمرۆ نەگەیشتبا، ڕەنگە پاش خوێندنەوەی، تێڕوانینێكی تەواو جیاوازمان سەبارەت بە شۆڕش و سیستەمە سیاسییەكان لا دروست ببێت. كاری ئەم ڕۆمانەش هەڵماڵینی پەردەی سەر نهێنییەكان و گەڵاڵەكردنی پرسیارە لە مێشكی خوێنەردا، ئەو پرسیارانەی كە سیاسییەكان هەمیشە لە هەوڵی شاردنەوەیاندا بوون.

له بڵاوكراوەكانی [illegible]